# عێراق و دەوروبەری

## کورد لەو ناوەندەدا

سامی شۆڕش

# عێراق و دەوروبەری

## کورد لەو ناوەندەدا

سامی شۆڕش

ناوی کتێب: عێراق و دەوروبەری: کورد لەو چەقەدا
دانانی: سامی شۆڕش
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ١٤٨
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب
بەرگ: شکار عەفان نەقشبەندی
نووسینی سەر بەرگ: محەمەد زادە
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
سەرپەرشتیی کاری چاپخانە: ئاوڕەحمان مەحموود
چاپی یەکەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر- ٢٠٠٢
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٣٢١)ی ساڵی ٢٠٠٢ی دراوەتێ

## بەغدا و تاران

## شەڕ و ناکۆکی لە نێوان وەستان و تازەبوونەوەدا

ماوەی یازدە ساڵە تاران و بەغدا لە مەودای شەڕێکی ناڕاستەوخۆدا دەژین، ئەگەرچی هەردوو وڵاتەکە لەو ماوەیەدا کەوتبوونە بەر سیاسەتی سزا و (الإحتواء المزدوج)ەوە لە لایەن ئەمریکاییەکانەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا کە جار جار هەوڵی خاوکردنەوەی گرژییەکانی نێوانیان دەدا بۆ بەهێزکردنی هەڵوێستەکانیان لە بەرامبەر دوژمنە هاوبەشەکەیان: ئەمەریکا، بەڵام زۆری نەدەبرد بۆمبا و کاتیۆشا لە ناو بەغدا و تاراندا ڕیسەکەی لێ دەکردنەوە خوری.

ئێران دوای هاتنی سەرۆک محەمەد خاتەمی، بەگەرمی کەوتە دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەک بۆ گیروگرفتەکانی لەگەڵ بەغدا.

هاندەریشی بۆ ئەم مەسەلەیە ئەوە بوو؛ بەڵکو بتوانێ ئاگری ڕێکخراوی موجاهدینی خەڵق بکوژێنێتەوە و، ئیتر بەهانە بەدەست توندڕەوەکانی ناو ئێرانەوە نەهێڵێ بۆ خۆ پڕچەککردن. هەروەها پەیوەندییەکانی وڵاتەکەشی چ لەگەڵ جیهان و چ لەگەڵ دەوڵەتانی دەوروپشت بخاتەوە سەر سکەی یاسا و پەیوەندیی نەرم و نیان. بەڵام لەو لای دیکەوە عێراقی پابەند بەسزا دەوڵەتییەکانەوە ئەنجامی تایبەتیی خۆی هەیە بۆ چۆنیەتی ڕەفتارکردن لەگەڵ ئێران و کارتی سیاسی ئێران.

لەم نێوانەدا ڕەنگە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست نموونەی دوو دەوڵەتی لەو شێوەیە نەبێت وەک عێراق و ئێران. ئەم دوو دەوڵەتە نەک هەر لە مێژووی کۆن، بگرە لە مێژووی هاوچەرخ و تازەشدا وایان لێکداوەتەوە کە بەهێز بوونی هەر کامێکیان لەنگەری نێوانیان تێک دەدات و، ئاسایش و ئیستقرار لە وڵاتەکەی دیکەدا دەخاتە بەر مەترسییەوە.

شێوەکان هەبووە.

بەر لە دامەزرانی عێراق و ئێرانی تازە لە بیستەکانی سەدەی ڕابردوودا، ئەو خاکەی پاشتر ناوی نرا دەوڵەتی عێراق گۆڕەپانی ناکۆکی و لەیەکدانێکی زۆر بوو لە نێوان ئێرانی شیعە و دەسەڵاتی ئیمپراتۆری عوسمانی کە ئەوسا فەرمانڕەوای ویلایەتە جیاکانی عێراق بوو. دامەزرانی ئێرانی تازە لەژێر پادشایەتی ڕەزا شا و دواتر کوڕەکەی شا ئەو ناکۆکی و ناتەباییەی نەک هەر کەم نەکردەوە بگرە توند و تیژتریشی کرد. ئەوەی زۆرتریش ئەم مەودا ئاڵۆزەی نێوان تاران و بەغدای بەرەو ئاڵۆزییەکی زۆرتر برد، بەهێزبوونی هەردوو دەوڵەت بوو لە ڕووی سیاسی و سەربازییەوە لە ناوچەکەدا. هاوبەشیی بەغدا و تاران لە چەند هاوپەیمانێتییەکی ناوچەیی وەک پەیمانی سەعد ئاباد (١٩٣٧) و پەیمانی بەغدا (١٩٥٥) کەڵکی خاوکردنەوەی ئەو نێوانە ئاڵۆزەی نەبوو ئەگەرچی ئەمەریکا و بەریتانیاش هەوڵێکی زۆریان بۆ ئەو خاوکردنەوەیە دا.

ئەوەی ڕاستی بێت: لەنگەری سیاسی و سەربازی لە نێوان بەغدا و تاران، زۆربەی کات لە بەرژەوەندیی تاران بووە، بەتایبەتی ئێران لە ڕووی ژمارەی دانیشتوان و پانتایی خاکەوە لە عێراق بەهێزترە. هەروەها لە ڕووی ئابووریشەوە دەسەڵاتێکی گەورەتری هەبوو لە بواری دەرهێنان و فرۆشتنی نەوت، بەڵام تەنیا لە دوو بڕگەدا ئەم لەنگەرە بەلای عێراقدا شکایەوە:

یەکەم: لە دوای شۆڕشی ئیمام خومەینی لە ١٩٧٩ کە ئەمەش بووە هۆی تەقینەوەی شەڕێکی خوێناوی کە لە ئەیلوولی ١٩٨٠ەوەی خایاند تا ئابی ١٩٨٨.

دووەم: لە دوای شەڕی کوێت لە ١٩٩٠-١٩٩١دا کاتێ توانستە سەربازییەکەی عێراق لە لایەن هێزی هاوپەیمانانەوە تێکشکێنرا و نەتەوە یەکگرتووەکان سزایەکی بەرفراوان و گەورەی بەسەر عێراقدا سەپاند.

ئێرانییەکان وەک عێراقییەکانیان نەکرد، هەلی تێکچوونی لەنگەریان لە

دوای شەڕی کوێت بۆ نانەوەی شەڕێکی تازە بەکار نەهێنا لە دژی عێراق، بەڵام توانیان لە ڕێگەی سیاسەتەوە کەڵکێکی زۆر لە لاوازبوونی دەوری عێراق لە ناوچەکەدا وەربگرن. ئەم ڕاستییە، ڕاستییەکی دیکە ناشارێتەوە کە ئێران لە هەمان کاتدا زەرەرێکی زۆر لەو گەمەیەی عێراق دەکات؛ زەرەری ئابووری، ئەمنی، سیاسی، ڕەنگە پشێوییەکانی ناو ئێران نموونەیەکی بەرچاوی ئەم حاڵەتەبن.

لەم نووسینەدا هەوڵ دەدرێ بەپەلە ڕووناکییەک بخرێتە سەر ئەو پەیوەندییە ئاڵۆزەی ئەم دوو دەوڵەتە کە هەمیشە نەک هەر ڕاستەوخۆ کاری لە کێشەی کورد و چارەنووسی گەلی کورد کردووە، بەڵکو کارێکی ڕاستەوخۆیشی لە بونیاتی سیاسیی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش کردووە.

## سەرەتایەک بۆ ناکۆکییەکان لە مێژووی هاوچەرخدا

بەر لە دامەزرانی دەوڵەتی عێراق، ویلایەتی بەغدا و بەسرە سەر بەدەوڵەتی عوسمانی بوون، عوسمانییەکانیش وەک مەعلوومە لە ڕووبەڕووبوونەوە و ناکۆکییەکی بەردەوام بوون لەگەڵ ئێرانی کۆن، چ بەهۆی جیاوازیی مەزەبی و چ بەهۆی تەماحی فراوان بوون و لێکدانی بەرژەوەندییەکانیان لە ناوچەکەدا.

ڕەنگە مێژوو بازی بەسەر زۆر ناکۆکی و شەڕی خوێناوی دابێ لە نێوان دەوڵەتاندا، بەڵام ئەو ڕووبارە خوێنەی لە نێوان عوسمانییەکان و ئێرانییەکاندا ڕژا بەدرێژایی سێ سەد ساڵ، تا ئێستا پێ دەچێ کارێکی زەحمەت بێت ئەو بارە مێژووییەی بەسەردا بدرێ.

گومان لەوەشدا نییە کە عێراقی کۆن، واتە هەر دوو ویلایەتی بەغدا و بەسرە، گۆڕەپانێکی گەورەی ئەو ناکۆکییەی نێوان ئێرانییە شیعەکان و عوسمانییە سونییەکان بوون. لێرەوە عێراقی تازە میراتگری بەشێکی زۆری ئەو ناکۆکییە بوو.

کاتێک ئێرانی تازە لەسەر دەستی ڕەزا خان دامەزرا لە ١٩٢٣-١٩٢٥دا، ناکۆکییەکانی بەغدا و تاران زیادی کرد کەمی نەکرد.

ئەمجارەیان هەر جیاوازیی مەزەب هۆکارە سەرەکییەکەی ناکۆکی نەبوو، بەڵکو چۆنیەتی داڕشتنی سنوور و مەسەلەی نەوت، کە ئەوسا سەرەتای دۆزینەوە و دەرهێنانی بوو، هەروەها دەسەڵاتی هەر دەوڵەتە لە ئاوی ئەروەندرووود بەشێکی کاریگەری دنەدانی ناکۆکی بوو لە نێوانیاندا. پێشتریش لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی هەوڵێک درابوو بۆ چارەکردنی ئەو ناکۆکییە بەتایبەتی لە مەیدانی ئاوی ئەروەندروودا، کاتێک هەر دوو دەوڵەت ساڵی ١٩١٣ پرۆتۆکۆلێکیان بەهاوکاریی بەریتانییەکان مۆر کرد.

ئینگلیزەکان کە ئەوسا، واتە دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی، لە لایەکەوە لە عێراق فەرمانڕەوایەتیان دەکرد، لە لایەکی دیکەوە لەگەڵ حکو ومەتی ڕەزا شا پەیوەندییەکی گەرموگوڕیان هەبوو، هەوڵی ئەوەیان دەدا بەر لە ناکۆکییەکانی ئەو دوو دەوڵەتە بگرن لەم پێناوەدا، کەچی تەماحە نەتەوەیی و کێشە مێژووییەکانیان کەمتر بواری ئەم جۆرە ڕێککەوتن و تەباییەیان دەدا. بۆیە داننانی هەر دوو دەوڵەت بەیەکدی چەندین ساڵی ویست. ئەوە بوو ساڵی ١٩٣٧ بەریتانیا کەوتەوە نێوانیان و توانی ڕێککەوتننامەیەکی تازەیان پێ ئیمزا بکات لە بارەی ئاوی ئەروەندڕوودەوە. بەپێی ئەو ڕێککەوتننامەیە تەواوی ئاوەکە تەسلیمی ئێران کرا، نزیکەی دە کیلۆمەترێک نەبێ لە نزیکی خوڕەمشەهر کە لە ژێر دەسەڵاتی عێراقدا مایەوە. بێجگە لەمە بەریتانییەکان توانیان سنوورێکی تازە لە نێوان عێراق و ئێراندا بکێشن کە بەپێی ئەو سنوورە تازەیە بەشێک لە ناوچە کوردییە نەوتییەکانی دەوری خانەقین و نەوتخانە بەر ئێران کەوتن.

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، ڕێککەوتننامەی ١٩٣٧ ڕێگەی لە تەشەنە سەندنی ناکۆکییەکان نەگرت، بەتایبەتی دوای گەشەکردنی ڕێچکەیەکی نەتەوەیی عەرەبی هاوپەیمانی لەگەڵ بزووتنەوە نەتەوەییەکەی تورک لەناو

عێراقدا. (ساطع الحصري) و کۆمەڵێک ئەفسەری عێراقی لەوانە (رەشید عالی گەیلانی)، نوێنەری ئەو ڕێچکەیە بوون، کە دواتر لەگەڵ ئەڵەمانەکان پەیوەندییەکی گەرمیان هەبوو. لەم بزووتنەوە عەرەبییە عێراقییەدا (امین الحسیني)ی فەلەستینی کە موفتیی قودس بوو، بەڵام لە بەغدا پەناهەندە بوو، دەورێکی زەروری دیت.

سەرانی ئەم ڕێچکەیە، پێیان وا بوو شیعەی عێراق لە ڕووی ڕەچەڵەکەوە ئێرانین و دەبێ بەشیان نەبێ لە حوکمی سیاسی و ڕۆشنبیریی وڵاتەکەدا. بۆیە تەواوی ڕێگەیان لە شیعەکان گرتبوو.

بگرە هەر نارەزایی و ڕاپەڕینێک لە ناوچەی خوارووی عێراق ڕووی بدایە بەفیتی ئێرانیان لە قەڵەم دەدا و بەشێک لە پیاوە ئایینییە شیعەکانیان بۆ ئێران دوور دەخستەوە. ئەم مەسەلەیە ببووە مایەی ناخۆشییەکی زۆر لە بەینی عێراق و ئێراندا.

دواتر ئینگلیزەکان توانیان هەردوو وڵاتەکە لە ١٩٣٧ لە چوارچێوەی پەیمانی سەعد ئاباد کۆبکەنەوە، دواتریش پەیمانی بەغدا دیسانەوە لە ١٩٥٥دا کۆی کردنەوە، بگرە هەر دوو وڵاتەکە لە چەند برگەیەکدا توانیان هاوکارییەکی باشی یەکدی بکەن؛ لە سەردەمی ڕووخانی کۆماری مەهابادا کاتێک بارزانییەکان گەڕانەوە کوردستانی عێراق، هەر زوو دەوڵەتی عێراق گرتنی و لە زیندانی قایم کردن. ئینجا چوار ئەفسەرە کوردەکەی لە سێدارە دا. دواتر کەوتە هاوکاری کردنی ئێران و تورکیاش بۆ شەڕی هێزەکانی سەرۆکی نەمر مستەفا بارزانی.

بەڵام دیاربوو ئەم هاوتەباییە تەنیا پەیوەندیی بەمەسەلەی ڕووبەڕووبوونەوەی کوردەوە هەبوو، چونکە زۆری نەبرد هەر دوو وڵاتەکە گەڕانەوە چاو لە یەکدی سوورکردنەوە. لێرەدا هەڵاتنی محەمەد ڕەزا شا لە ساڵی ١٩٥٣دا بۆ بەغدا دادی چارەسەرکردنی یەکجارەکیی کێشەکانی نەدا.

شۆڕەوی بۆ دەوروبەری ئێران: کۆماری ئازەربیجان و کۆماری مەهاباد له* لەلایەکەوه کودەتاکەی دکتۆر محەمەد موسەددەق، لەلایەکی دیکەوه بۆیه تووشی ترسێکی گەوره بوو لەوەی ئەو دەسەڵاته له عێراقیشدا بڵاوببێتەوه و تەواوی سنووری ڕۆژئاوای بکەوێته بەر مەترسییەوه، ئەم ترسه زۆری نەبرد، ساڵی ۱۹۵۷ وای کرد سازمانی ئەمنیەتی ئێران (ساواک) بەشێکی تایبەتی بەکوردستان بکاتەوه له نزیکیشەوه بکەوێته چاودێرکردنی ناوەوەی عێراق.

هەڵگیرسانی شۆڕشی چواردەی تەمموز له عێراقدا، لەسەر دەستی کۆمەڵێک ئەفسەر، هەندێک چەپ و کۆمۆنیست و هەندێکی دیکه نەتەوەیی عەرەبی، ئینجا تەفروتووناکردنی بنەماڵەی پادشایەتی له بەغدا. وێنەیەکی زۆر تەڵختری له بزووتنەوەی موسەددەق لەبەر چاوی شای ئێران دروست کرد. بگره ئەو دڵگەرمییه و خۆشییەی قاهیرەی جەمال عەبدولناسر و مۆسکۆی نیکیتا خرۆشۆف بەرامبەر بەشۆڕشەکه نواندیان ئەوەندەی دی ترس و لەرزی خسته ناو دڵی ئێران. بۆیه هەر زوو کەوته مشووری کارکردن بۆ سەرنگونکردنی ڕژێمه تازەکەی بەغدا. لەم بوارەدا بەرپرسی فایلی عێراقی له ساواک، عەقید عیسا پەژمان-ی ڕەوانەی بەغدا کرد وەک یاریدەدەری سکرتێری سەربازیی له باڵیۆزخانەی ئێران. هەروەها نەخشەیەکیشی بۆ مەبەستی ڕووخاندنی عەبدولکەریم قاسم کێشا که ناوی (نەخشەی سەوز) یان (ترحی سبز) بوو. بەزمان ڕاسپێردرا بەهەر نرخێک بێت دەبێت ئەو نەخشەیه جێبەجێ بکات. بەڵام دیاربوو عەبدولکەریم قاسم و شۆڕەوی و کۆمۆنیستەکانی عێراق توانیبوویان له ماوەیەکی ئێجگار کەمدا هەموو جۆره دەرفەتێک له بەرامبەر گەڕانەوەی پادشایەتی بۆ عێراق، یان سەرگرتنی هەر نەخشەیەکی وەک نەخشەی سەوز بگرن. بۆیه چەندی (پەژمان) هەوڵی دا بۆی نەکرا پاشماوەی ڕژێمه پادشاییەکەی عێراق ڕێکبخاتەوه و هانیان بدا له دژی قاسم نه شیعەکان بەدەنگییەوه چوون بەهۆی ئەوەی که قاسم له دایک، یاخود له دایک و

باوکرا شیعە بوو. لێرەوە (پەژمان) کەوتە خولیای ڕاکێشانی کورد بۆ ناو بازنەی نەخشەکەی.

ئەوسا گەڕانەوەی سەرۆکی نەمر مەلا مستەفا بارزانی لە مۆسکۆوە ترسێکی زۆرتری لە دڵ و دەروونی ئێراندا دروست کردبوو، چونکە بارزانی بەلای ئێرانەوە هەڵگری یادەوەرییەکانی کۆماری مەهاباد بوو. هەروەها سەرکردەی بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد و سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان و خاوەن ڕابردوویەکی پڕ خەباتیش بوو لە بەرامبەر ڕژێمی شا. بۆیە (پەژمان) لەجیاتی ئەوەی ڕوو لە بارزانی بکات، ڕووی لە مەکتەبی سیاسیی پارتی دیموکراتی کوردستان کرد. هەر زوو توانی پەیوەندییەکی گەرم لەگەڵ ئەندامەکانی دروست بکات. هەروەها دواتر ئەم پەیوەندییە زۆر گەرمتر بوو.

لێرەوە ئێران کەوتە ئەوەی بەڵکو کورد بەکار بهێنێ لە تاووتوێکردنی ناکۆکییەکانی خۆی لەگەڵ عێراق. هەروەها کەوتە دروستکردنی پەیوەندیی لەگەڵ چەند کەسایەتییەکی شیعەی سەر بەڕژێمی پادشایەتیی کۆن وەک (هادی چەلەبی) کە ئەوسا نیشتەجێی لوبنان بوو. لەو لاوە نەخشەکەی ئێران بۆ سەرنگونکردنی ڕژێمە تازەکەی عێراق ڕاستەوخۆ سەرنەکەوت، بەڵام ناراستەوخۆ بەرهەمێکی هاتە بەر ئەویش کودەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣ بوو.

شای ئێران دوو هەڵوێستی بەرامبەر ئەو کودەتایە وەرگرت. یەکەم: کەوتە دنەدانی بۆ کۆتایی هێنانی دەسەڵاتی کۆمۆنیستەکان و شۆڕەوی لە عێراقدا. دووەم: کەوتە خۆ دوور لێوەگرتن و خۆ پاراستن لە دۆستایەتیی لە ترسی پەرەسەندنی پەیوەندییەکانی ڕژێمە تازەکەی عێراق لەگەڵ میسری(عەبدولناسر) و سوریای بەعسییەکان. لە ڕاستیشدا زۆری نەبرد، لە نیسانی ١٩٦٣دا یەکێتییەکی بەپەلە لە نێوان هەر سێ دەوڵەتەکەدا ڕاگەیەندرا.

تاران هێمنییەکی ئەوتۆیان بەخۆیانەوە نەدی، ئەگەرچی سەرۆکی کۆمار (عەبدولڕەحمان عارف) لە ساڵی ١٩٦٦-دا سەردانێکی بەپەلەی تارانی کردو ویستی قەناعەت بەئێران بێنێ دەست لە یارمەتیدانی کوردی عێراق بکێشێتەوە.

دوای کودەتای ١٧ ی تەمووزی ١٩٦٨ ناکۆکییەکان تەشەنەیان کرد. ئەوسا بەعسییەکان دوای هاوکاریکردنێکی کورت لەگەڵ ئەمەریکییەکان و لەندەن، هەر زوو دەستیان لەو دوو لایەنە کێشایەوە و کەوتنە بەرزکردنەوەی دروشمە نەتەوەییە زەقەکانی جارانیان. لەوەش قووڵتر بایەخێکی زۆریان دایە دروشمی سوشیالیستی و هەڵوێستی توندوەرگرتن لە بواری کێشەی فەلەستیندا، بگرە خۆیان لەوە نەدەپاراست بڵێن کە حوکمی بەعس لە عێراقدا (لە ئەنجامی ئەو شکستە گەورەیەی تووشی عەرەب هات لە ٥ی حوزەیرانی ١٩٦٧ هاتۆتە سەر حوکم).

زۆری نەبرد، لە ١٩٦٩دا بەغدا پێشوازی لە سەرۆکی پێشووی ساواک ژەنەراڵی هەڵگەڕاوە لە ڕووی شا (بەختیار تەیمور) کرد. پێشتریش دەستەیەک خەڵکیان لەسێدارە دا بەتۆمەتی ئەوەی جاسووسییەتیان بۆ ئیسرائیل و ئێران کردووە. هەروەها ڕێگەیان دا چەند سەرانێکی کوردی ئێران و حزبی تودە لە بەغدا جێگیربن. بگرە دەستیان دایە هاوکارییەکی زۆری حزبە گەورەکانی ئێران لە دژی شا. هەر لە شەستەکاندا عێراق دەرگای لەبەردەم ئیمام خومەینیدا کردەوە کە لە تورکیا شوێنەکەی خۆی بگوێزێتەوە بۆ نەجەف.

ئێران لەو سەردەمەدا دەیویست لەگەڵ عێراق ئەگەر ماوە هەبێت کەمێک خاوی بکاتەوە نەوەکا لەژێر پاڵەپەستۆی ناکۆکییەکاندا بەغدا زۆرتر بەرەو ڕۆژهەڵات و شۆرەوی بڕوات. بۆیە بەپەلە لەو ساڵەدا لێپرسراوێکی گەورەی ئێرانی ڕەوانەی عێراق کرد بۆ گفتوگۆکردن لەسەر بابەتی ناکۆکییەکانی نێوان هەردوو لا. ئەم چوونەی بەغدا هیچی لێ شین نەبوو، بگرە لە سەرەتای حەفتاکاندا عێراق ڕایگەیاند، کە کۆمەڵێک ئەفسەر و

خەڵکی سەر بەئێران ویستوویانە لە عێراق کودەتایەک ئەنجام بدەن، بەڵام حکوومەت کودەتاکەی تەفروتوونا کردووە.

لەو سەردەمەدا عێراق سەرکەوتنێکی دیکەی لە دژی ئێران وەدەستهێنا کاتێک لە ئاداری ۱۹۷۰ لەگەڵ سەرکردایەتیی شۆڕشی کورد ڕێککەوتننامەیەکی سیاسیی مۆرکرد بۆ ئۆتۆنۆمی. ئەم گۆڕانکارییانە سەرجەمی مایەی ترسی تاران بوو لەو دەورە تازەیەی عێراقدا، بۆیە دوودڵی لەوە نەکرد یەکسەر ئەو سێ دوورگەیەی کەنداو (تومبی گەورە و تومبی بچووک و ئەبو موسا) داگیر بکات کە بەریتانییەکان لێی کشانەوە. هەروەها کەوتە کۆکردنەوەی جبەخانەیەکی گەورەی چەک و تەقەمەنی بەنیازی ترساندنی عێراق.

تەق و تۆق لە ناوچە سنوورییەکاندا بەردەوام هەبوو لە نێوان ئێران و عێراقدا، بەتایبەتی لە ناوچەی مەندەلی و بەعقوبە و بەدرە و جەسسان. بگرە جار جار لە ئەروەندروودیشدا ناکۆکی و وردە ڕووبەڕووبوونەوەی بچووک دروست دەبوو. ئەم هەموو ناکۆکییانە تا دەهات گەورەتر دەبوون لەگەڵ هەڵکشانی زۆرتری بەغدا بەرەو شۆرەوی و کۆمۆنیستەکانی ناوەوە. ئینجا خۆماڵیکردنی نەوت و شەڕی کورد و بەغدا لە ۱۹۷٤ دەورێکی زۆریان هەبوو لە گەشکردنەوەی ئاگری ناکۆکی.

بەڵام دواتر کە هێزە سەربازییەکانی عێراق هیچیان لە بەرامبەر کورد پێنەکرا، لەو لای دیکەوە دیاربوو عێراق ئامادەیی دەربڕیبوو بۆ بەشداریکردن لە فشار خستنە سەر سوریە ئەگەر بێتو ئێران و ئەمەریکا کەشوهەوای ئەوەی بۆ دروست بکەن ئاگری شەڕ و بەرگری لە کوردستاندا بکوژێتەوە، بەرهەمی ئەم هەوڵە ڕێککەوتننامەی (ئەلجەزائیر) بوو لە ٦ ی ئاداری ۱۹۷٥ کەب ووە هۆی نسکۆهێنانی شۆڕشی گەلی کورد لەو سەردەمەدا. لەم ڕێککەوتننامەیەدا ئەوەی ئێران دەیەویست لە ئاو و سنوور و دەسەڵات لە ناوچەی کەنداودا وەدەستی هێنا.

## عێراق و ئوردن

پەیوەندییەکانی عێراق و ئوردن لە ساڵانی شەڕی ئێراندا دەرگای عەممانی لەبەر دەم بڵاوبوونەوەی دەسەڵاتی بەغدا لە ناو ئوردنییەکاندا خستە سەر پشت. لێرەوە بەغدا هەوڵێکی زۆری دا بۆ بەستنەوەی نووسەران و ڕۆژنامەنووسان و سەرمایەداران و سیاسەتمەدارانی عەممان بەداموودەزگا و دەسەڵاتی خۆیەوە. لەم بوارەدا دەکرێ هێما بۆ ئەوە بکەین کە سەرکردایەتی عێراق گوندێکی هاوچەرخ و نوێی بچکۆلانەی دروست کرد لە عەممان و کلیلی هەر خانوویەکی ئەو گوندەی بەخۆڕایی بەخشییە یەکێ لە سەرنووسەرانی ڕۆژنامەکانی ئوردن. بەردەوام بانگی دەکردن بۆ بەغدا و لەسەر ئاستی زۆر بەرز پێشوازیی لێ دەکردن و ماشێنی تازە و هەرچی پێویستییێکیان هەبووایە بۆی جێبەجێ دەکردن.

عێراق دەرگای بازاڕەکانی خۆی لەبەردەم بازرگانەکانی ئوردن کردەوە و هانی ئەوەی دەدان پڕۆژەی پیشەسازی و ئابووری لە عێراقدا بکەنەوە.

سیاسەتمەدارانیان بانگ دەکرد و لە دژی سوریا دەیاندواندن و ببڕای ببڕ خۆیان لە باسکردنی سەردەمی پادشایەتی نەدەدا، بگرە جار جار هێمای ئەوەشیان بۆ دەکردن کە بەدەستیانەوە چاو بەمێژووی ئەو سەردەمەی عێراق بگێڕنەوە و ئیعتبار بۆ خانەوادەی پادشایەتی عێراق بگێڕنەوە.

ئەم هەموو هەوڵ و تەقەلایانە وایان کرد لە ناو ئوردنییەکاندا جێگای دەسەڵاتی عێراق فراوان بێت. هەروەها ئوردنییە بەرەچەڵەک فەلەستینییەکان لەم نێوانەدا دەورێکی گەلێ گەورەیان گێڕا، بگرە تا ئێستاش ئەو بازرگانە ئوردنییانەی لە سەردەمی شەڕی ئێراندا لە عێراق باویان هەبوو، تا ئێستاش کارو پڕۆژەکانیان لە کارە و فشارێکی زۆر دەخەنە سەر حکوومەتەکەی خۆیان بۆ پاراستنی پەیوەندی باش لەگەڵ بەغدا.

سەرۆک وەزیرانی ئێستای ئوردن، ئەندازیار (عەلی ئەبو ئەلراغیب) یەک

لەو کەسانەیە کە خۆی و خزم و کەسەکانی بەرژەوەندییەکی ئابووریی زۆریان لەگەڵ بەغدا هەیە. هەروەها وەزیری پیشەسازی و بازرگانی (واسف عازر) یەک لە بەعسییە کۆنەکانی ئوردنە کە تا ئێستاش لایەنگری هاوکارییە لەگەڵ بەغدا.

دوای وەستانی شەڕی عێراق و ئێران لە ١٩٨٨، ئوردن شێوازی پەیوەندییە ئابوورییەکانی خۆی لەگەڵ بەغدا پاراست. بەڵکو لەوەش زیاتر لەگەڵ عێراق و قاهیرە و یەمەن کەوتە دروستکردنی تەوەرێکی تازەی عەرەبی. یەک لە مەبەستە گەورەکانی ئەو تەوەرە مەسەلەی پیشەسازیی چەکی قورس و هەندێ چەکی کۆمەڵکوژ بوو. لە ڕاستیدا ئوردن پارە و ئابوورییەکەی یاریدەی ئەوەیان نەدەدا لەم بوارەدا هاوبەشێکی کاریگەر بێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەش چاوی لەوە بوو بەڵکو لە ئەنجامە ئابوورییەکانی ئەم پرۆژە سەربازییە، ئەگەر سەرکەوتوو بوو، قازانجێکی ئابووری بکات.

دیار بوو داگیرکردنی کوێت لەلایەن سوپای عێراقەوە لە ئابی ١٩٩٠کۆتایی بەم تەوەرە هێنا.

## دوای داگیرکردنی کوێت و سەردەمی سزاکان

داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراقەوە؛ ئوردنی خستە بەردەم تاقیکردنەوەیەکی زۆر سەخت و زەحمەت. لەلایەکەوە بازاڕە ئابوورییەکەی ئوردن تا ڕادەیەکی زۆر پشتی بەعێراق بەستبوو، بۆیە واز هێنان لەم بازاڕە کارەساتێکی گەورەی بۆ شا حوسێن دروست دەکرد. لە لایەکی دیکەوە خەڵکی ئوردن بەتایبەتی بەرەچەڵەک فەلەستینییەکان، پشتگیرییەکی زۆریان بۆ عێراق نیشان دا لە دژی کوێت و ئەمەریکا، بەتایبەتی دوای ئەوەی عێراق چەند مووشەکێکی لە ئیسرائیل گرت. لە لای سێیەمیشەوە کوێتییەکان و سعودییەکان کە تا سەردەمی داگیرکردنی کوێت یارمەتییەکی زۆری ئوردنیان دەدا لە بواری نەوت و پارەوپوولدا، ئەم یارمەتیانەیان ڕاگرت و پەیوەندیی خۆیان لەگەڵ عەممان بەتەواوی بڕی. شا

نەچێت. بەڵام هەڵگرتنی دوو شووتی بەیەک دەست کارێکی مەحاڵ بوو، بۆیە لە ئەنجامدا کار بەوە شکایەوە تەنیا لەگەڵ عێراق بمێنێتەوە. ئەمەریکاییەکان ئەم هەڵوێستەی شا حوسێنیان بەدڵ نەبوو. بەڵام دەشترسان بەهۆی فشاری ناوخۆی ئوردن، عێراق زیانێکی گەورە لە بەرژەوەندییەکانیان بدات بەوەی هەلومەرجی ناوەوەی ئوردن بخاتە بەردەم مەترسی و هەڵوەشانەوە. بۆیە لەلایەکەوە نارازی بوون، لەلایەکی دیکەوە درێژەیان بەپەیوەندییەکانی خۆیان لەگەڵ عەممان دەدا، بەتایبەتی کە واشنتۆن لەو سەردەمەدا شا حوسێنی بۆ ئەوە هەڵگرتبوو بەڵکو لە چارەسەرکردنی کێشەی فەلەستینییەکان و ئیسرائیل دادوەرییێکی سەرەکی ببینێ.

هەروەها واشنتۆن ئەوەشی لەبەر چاو بوو کە ئوردن لە ڕووی جوگرافییەوە هەلومەرجێکی زۆر سەخت و ئاڵۆزی هەیە، لەلایەکەوە عێراق لەسەر سنووری ڕۆژهەڵاتدا ڕاکشاوە. لە سەرووشیەوە سوریا کە هیچ کاتێک خاوەنی پەیوەندیەکی خۆش نەبووە لەگەڵ ئوردنییەکان. لەولای دیکەوە ئیسرائیل و فەلەستینییەکان، ئینجا سعودیە؛ کە ئەویش لەگەڵ ئەوەی هاوبەشی پەیوەندییەکی پادشایەتی بووە لەگەڵ شا حوسێن، بەڵام لە هەمان کاتدا ناکۆکییە کۆنەکانی نێوان شەریفی حیجاز و خانەوادەی شا عەبدولعەزیز بەردەوام تارماییەکی خستبووە سەر پەیوەندییەکانی هەر دوو وڵاتەوە.

ئەمە بێجگە لە گیروگرفتە ناوخۆییەکانی ئوردن چ لە ڕووی ئابووری و چ لە ڕووی پێکهاتەی کۆمەڵگایەوە.

لەم بوارەدا شا حوسێن لە دوای داگیرکردنی کوێت سەردانی بەغدای کرد و، ویستی بەهەموو توانایەکی خۆیەوە سەرۆک کۆماری عێراق بەوە قەناعەت پێبکات بەڵکو لە کوێت دەکێشێتەوە. بەڵام هەوڵەکەی بێهوودە بوو. لە ئەنجامدا کەوتە هەوڵی دۆزینەوەی چارەسەرێکی عەرەبی بۆ کێشەی داگیرکردنی کوێت، بەڵام ئەم هەوڵەشی بێهوودە بوو، کاتێک

کوێت و سعودیە پشتیان لەم جۆرە پێشنیارە کرد و ڕوویان کردە چارەسەرێکی نێودەوڵەتی.

زۆری نەبرد لە بەهاری (١٩٩١)دا عیراق تووشی شکەستییەکی سەربازیی گەورە هات و، لەژێر فشاری هێزەکانی هاوپەیمانێتیی دەوڵەتیدا ناچار بوو بەپەلەپرووزێ لە کوێت بکشێتەوە. لە کوردستان و لە خوارووی عێراقدا دوو ڕاپەڕین تەقینەوە. ئەوەی کوردستان کەمتر ئوردنی شڵەژاند چونکە شا حوسێن لە کۆنەوە جۆرە پەیوەندییەکی لەگەڵ کورد هەبووە و دەیزانی کورد بەتەمای خۆ دابڕاندن نین لە عێراق. بەڵام ئەوەی زۆرتر شڵەژاندی ڕاپەڕینەکەی خوارووی عێراق بوو کە ئیسلامییەکان بەرپایان کرد بوو.

ترسی شا حوسێن لەوە بوو ئەم ڕاپەڕینانە تەشەنە بکەن و بەهۆی لاوازیی ڕژێمی بەغداوە بگەنە ناو وڵاتانی دەوروپشتی عێراقیش وەک ئوردن. بۆیە هەموو هەوڵێکی ئەوە بوو ڕێگە لەم ڕاپەڕینانە بگیرێ بەتایبەتی ئەوەی خوارووی عێراق.

هەروەها شا حوسێن خەمی پەیوەندییە بازرگانییەکەی نێوان عەممان و بەغدای بوو کە بەشێکی زۆری ئابووری ئوردن لە ساڵانی شەڕی عێراق - ئێرانەوە بەسترابوونەوە بەئابووریی بەغدا. ئینجا بایەخی عێراق و نەوتەکەی بەنیسبەت ئوردن ئێجگار زیادی کرد، بەتایبەتی دوای ئەوەی سعودیە و کوێت بڕیاریان دا پەیوەندی و یارمەتییە ئابوورییەکانیان بۆ عەممان ڕابگرن. ئەو کاتە سعودیە نەوتێکی زۆری بەخۆڕایی بەئوردن دەدا. هەروەها کوێت لە ڕووی دراو و پارەوە یارمەتییەکی زۆری دەدا.

لەوانەش کاریگەرتر بۆ سەر ئابووریی ئوردن بڕیاری کوێت بوو بەدەرکردنی هەرچی ئوردونی یان فەلەستینی هەیە لە کوێت.

ئەمانە ژمارەیان خۆی لە دوو سەد هەزار کەس دەدا، ئەمانە بەدرێژایی بیست ساڵی ڕابردوو سەرچاوەی دراوێکی زۆری بێگانە بوون بۆ خەزێنەی ئوردن، هەروەها یاریدەیەکی زۆری ئابووریی ئوردنیان دەدا. بەڵام دواتر کە

لە کـوێت دەرکـران، بوون بەبار و بەقـورسـاییـیـەکی گـەورە بەسـەر شـانی ئوردنەوە.

لەم گێژەنەیەدا، شـا حوسـێن بڕیاری درێژە پێدانی پەیوەندییەکانی خۆی دا لەگەڵ بەغدا. بەتایبەتی کە بینی ئەمەریکاییەکان گلەییەکی ئەوتۆیان لەم جۆرە پەیوەندییە نییە بەو مەرجەی نەگاتە ڕادەی پەیوەندی و هاوکاریی سیاسی. هەروەها نەگـاتە ئەوەی ئوردن سزا نێودەوڵەتییەکانی سەر عێراق بشکێنێ.

لە سـاڵانی یەکەمی سزاکـاندا، واشنتۆن هەندێ جار بیری لە ڕووخـاندنی ڕژێمی عێراق دەکردەوە لە ڕێگەی هاوکـاریکردنی ئۆپۆزیسـیۆنی عێـراقی. لەم بوارەدا نە سوریا و نە ئێران بەکەڵکی واشنتۆن نەدەهاتن. بەڵکو تەنیا ئوردن هەبوو بێجگە لە تورکیا، کە بتوانێ ئەم بۆشاییە پڕ بکاتەوە ئەگەر هاتوو ئەمەریکا ویستی بەڕاستی ڕێگەی ڕووخاندنی ڕژێمی بەغدا بگرێتە بەر، کوێت بەپلەی یەکەم و سعودیە بەپلەی دووەم خۆیان لەم ئەرکە دزیبۆوە و پێیان وابوو ڕەنگە گۆڕینی دەسەڵات لە عێراق بەقازانجی ئێرانییەکان تەواو ببێت.

لێرەوە ئوردن کەوتەوە بازرگانی نەوت لەگەڵ بەغـدا، بەتایبەتی عـێراق هانی دەدا بۆ ئەو هاوکـارییە بـازرگـانیـیـە و دەیویست لە ڕێگەی نەوت و، نرخی هەرزان و خـۆڕایی نەوتەوە کـەمـێک لە هەڵـوێسـتی شـا حـوسـێن و ڕۆیشـتنی بەرەو ئەمەریکا لە مەسـەلەی عێراقدا کەم بکاتەوە. دوای چەند سـاڵێکی کـەم پرۆتۆکۆلێکی بازرگـانی لە نێـوان عەممان و بەغـدا مـۆر کـرا. بەپێی ئـەم پرۆتۆکـۆلە بودجـەی گـۆڕینەوەی بـازرگـانـی لەنێـو هەر دوو وڵاتدا گەیشتە ٤٥٠ ملیۆن دولار.

ئەم پەیوەندییـە ئابوورییـە تەواوی پەیوەنـدییـە ئـابوورییـەکانی عێـراق و ئوردنی تـازە کـردەوە. بگرە لە هەندێ ڕووەوە وای کـرد عـێـراق تا ڕادەیەک پشت بەبازرگـانییـەکانی لەگەڵ عـەممان ببەستێ. هەروەها بەغدا توانی لەم ڕێگەیەوە دەســەڵاتی خـۆی لەناو ئوردن تازە بـکاتەوە، بەتـایبــەتی دوای

ئەوەی بەعسییەکانی ئوردن کەوتنەوە کار و ئینجا بزووتنەوە ئیسلامییەکەی ئوردنیش زیندوو بووەوە.

لە ماوەی دە ساڵی ڕابردوودا، زۆربەی ئەو کەسانەی پۆستی سەرۆک وەزیرانی ئوردنیان وەرگرتووە، یان پۆستی وەزارەتە گرنگەکانیان لە دەست بووە، خەڵکانی سەر بەعێراق بوون. تەنیا سەرۆک کۆماری پێشوو (عەبدولکەریم کەباریتی) نەبێت لە ١٩٩٥-١٩٩٦ کە بەئەتنیی عێراق بەناوبانگ بوو. هەروەها وەزیری دەرەوەی ئێستا (عەبدولئیلاه ئەلخەتیب) کە زۆرتر لە دەوڵەتە عەرەبییەکانی کەنداو نزیکە.

لە سەردەمی (کەباریتی)دا، ئوردن توانی پەیوەندییەکانی خۆی تا ڕادەیێک لەگەڵ دەوڵەتانی کەنداودا هێور بکاتەوە. بەڵام ئاساییکردنەوەی ئەم پەیوەندیە دیار بوو کارێکی سەخت و زەحمەت بوو، بەتایبەتی کە هێشتا شا حوسێن لە ژیان بوو. هەروەها کەباریتی توانی ڕادەی پرۆتۆکۆلی نێوان عێراق و وڵاتەکەی نزم بکاتەوە، کە ئەمە جێگەی ناڕەزامەندییەکی زۆری عێراق بوو. بەڵام دیار بوو لەو سەردەمەدا کەباریتی بەتەواوی هەوڵی تەسککردنەوەی مەودای پەیوەندییەکانی ئوردن و عێراقی دەدا. بۆیە لە ١٩٩٥دا ئوردن دەرگای لەبەردەم حوسێن کامل و براکەی کردەوە. هەروەها ماوەی پێدان چالاکیی سیاسی لە دژی بەغدا بنوێنن. دواتر ماوەی دا بزووتنەوەی ویفاقی نیشتمانیی عێراق کە دکتور ئەیاد عەللاوی سەرکردایەتیی دەکات بارەگایەک لە عەممان بکاتەوە. بەڵام ئەم هەوڵانەی کەباریتی سەریان نەگرت. ڕەنگە هەندێ لە هۆیەکان بگەڕێتەوە بۆ ئەو گیروگرفتانەی بەغدا لە بەردەم کەباریتیدا لەو ماوەیەدا دروستی کرد، بەڵام هۆیە سەرەکییەکانی پەیوەندییان بەهەڵوێستی کوێت و سعودیەوە هەبوو، بەتایبەتی ڕازی نەبوونیان بەپڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە ئابوورییەی لە ئوردن دروست ببوو لە ئەنجامی نزمبوونەوەی ڕادەی بازرگانییەکەی لەگەڵ بەغدا.

سەرباری ئەمانە، شا حوسێن هەمیشە چاوی لەوە بوو ئەم هاوکارییەی لەگەڵ بەغدا نەبێتە هۆی سارد و سڕی لەگەڵ ئەمەریکا و دەوڵەتانی

ڕۆژئاوا، چونکە ئەمانە لە دوا حسێبدا هاوپەیمانی ستراتیژیی ئوردن بوون. بۆیە بەردەوام لە گفتوگۆکانیدا لەگەڵ سەرانی دەوڵەتانی ڕۆژئاوا، بەتایبەتی ئەمەریکا و بەریتانیا پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە دەبێت واشنتۆن سیاسەتی خۆی بەرامبەر بەعێراق ڕوون بکاتەوە: ئایا بەتەنگ ڕووخاندنی ڕژێمی بەغدایە یان دەیەوێ تەنیا سزای بدات و لە ئەنجامیشدا بیگێڕێتەوە ناو بازنەی شەرعیەتی نێودەوڵەتی و ناوچەیی؟ هێمنیشی دەکردنەوە کە ئوردن لەگەڵ هەر سیاسەتێکە ئەوان هەڵی دەبژێرن بۆ پەیڕەویکردن بەرامبەر بەعێراق.

وەڵامی ئەم پرسیارە لای شا حوسێن ڕوون نەبوو. کەچی هاوپەیمانە ڕۆژئاواییەکانیشی ئامادە نەبوون هیچی ئەوتۆی بۆ ڕوون بکەنەوە.

بۆیە جار جار وای ڕەفتار دەکرد وەک ئەوەی ڕژێمی بەغدا ماوەیەکی کەمی لەبەردەم مابێتەوە. جار جاریش وا دەجوولایەوە کە ئوردن هیچ کێشەیەکی لەگەڵ عێراق نییە و ئامادەیە کار بۆ لابردنی سزاکانی سەری بکات.

بە هەر حاڵ، بەغداش لەو سەردەمەدا کەوتبووە تەمای درزخستنە دیواری سزا نێودەوڵەتییەکانەوە. پێشی وابوو ئوردن ڕەنگە پانتاییەکی ئاسان بێت وەک تورکیا، بۆ بەکارهێنانی لە پێناو ئەو درز تێخستنە.

گەورەترین ئامرازی دەستی بەغدا پرۆتۆکۆلە ئابووری و نەوتییەکەی بوو لەگەڵ عەممان. بۆیە هەر کە بیویستایە زۆرتر ئوردن ڕاکێشێتە لایەنی خۆی، بواری پرۆتۆکۆلەکەی تازە دەکردەوە و زیادی دەکرد. هەر جارێکیش ویستبای فشار بخاتە سەر ئوردن و تووشی مەترسیی بکات جێبەجێکردنی پرۆتۆکۆلەکەی دوا دەخست، یان تەگەرەی تێدەخست. تەنانەت هەندێ جار تەگەرە تێخستنەکان دەگەیشتە ڕادەی ئیعدامکردنی ئوردنییەک لە بەغدا بێ پرس کردن بەعەممان، یان ڕووتکردنەوەی ماشێنی باڵیۆزی ئوردونی لە ڕێگەی بەغدا و سنووری ئوردن. کەچی ئوردنییەکان چونکە پێویستیان بەجێبەجێکردنی پرۆتۆکۆلەکە دەبوو هەمیشە چاویان لەم ڕووداوانە

دەپۆشی.

ئوردنییەکان ئەم جۆرە پرۆتۆکۆلانە بەشەرعی دەزانن و پێیان وایە ئەنجوومەنی ئاسایش ڕێگەی نەبڕیوە لە پەیوەندییە ئابوورییەکانیان لەگەڵ بەغدا. بەڵام بەغدا وای لێکدەداتەوە کە ئەم جۆرە پرۆتۆکۆلانە درزێکی گەورەی دروست کردووە لە دیواری سزاکان و ڕەنگە درێژە پێدانیان هانی دەوڵەتانی دیکەش بدات بۆ پەیڕەویکردنیان.

ڕەنگە کارێکی باش بێت ئەگەر لێرەدا ئەوە لەبەرچاو بگرین کە دوا پرۆتۆکۆلی نەوتی و بازرگانیی بەینی بەغدا و عەممان کە لە کۆتایی مانگی ئابی ڕابردوو مۆرکرا، وای نەخشە بۆ کێشراوە ڕادەی بازرگانیی لە نێوان بەغدا و عەمماندا لەم ساڵەدا لە چوارسەد و پەنجا ملیۆن دۆلارەوە بەرز بکاتەوە بۆ یەک ملیار دۆلار. هەروەها ڕادەی ناردنی نەوتی عێراقی بۆ ئوردن بەرز بکاتەوە بۆ پێنج ملیۆن تەن، نیوەی بەخۆڕایی و نیوەکەی دیکەشی بەنیوە قیمەت.

هەروەها لەم نێوانەدا ئوردن کەڵکێکی زۆری لە دوو بواری ئابووریی دیکە وەرگرتووە: بەرنامەی نەوت بەرامبەر بەخۆراک کە زۆربەی کۆنتراکتەکانی داوودەرمان لەگەڵ عەممان مۆر دەکرێ، بەندەری عەقەبە کە بەشێکی زۆری کەلوپەلی عێراق تا ئێستاش لەوێوە دێت.

بەڵام عێراق تەنیا ئوردنی نەویستووە بۆ درز خستنە ناو دیواری سزاکانەوە، بەڵکو بۆ وروژاندنی تەماحە ئابوورییەکانی وڵاتانی دەوروپشتیش بەکار دەهێنێ، بەتایبەتی سوریا. هەروەها سەرباری مەسەلەی ئابووری، ئوردنی ویستووە بۆ بەڕێوەبردنی زۆر لە پەیوەندییە ناڕاستەوخۆکانی خۆی لەگەڵ ئەمەریکا. لەم بوارەدا ڕەنگە جێگەی خۆی بێت هێما بۆ ئەوە بکەین کە لە ماوەی ژیانی شا حوسێندا، میر حەسەنی برای، کە ئەوسا جێنشینی بوو، ڕۆڵێکی زۆری هەبوو لەوەی جۆرە پەیوەندییەکی ناڕاستەوخۆ لە نێوان بەغدا و تەل ئەبیبدا دروست بکات، بەڵام دواتر ئەم پەیوەندییانە تووشی پسان هاتن کاتێک ئەمەریکا پێی

زانی و داوای له ئیسرائیل کرد بەدەنگ داخوازییەکانی میر حەسەنەوە نەچێت.

دوای کۆچکردنی شا حوسێن و سەرۆکی سوریا (حافظ ئەلئەسەد) هەردوو کوڕەکانیان هاتنە سەر کار، بەغدا سەرەتا کەمێک تووشی مشەوەشی بوو، بەتایبەتی لەوە دەترسا کە شا عەبدوڵڵای دووەم و بەشار ئەلئەسەد بەرەو ڕۆژئاوا بڕۆن و، زۆرتر پەیوەندییەکانیان لەگەڵ عێراق سارد بکەنەوە. بەڵام دواتر ئەم مەترسییانەی عێراق ڕاست دەرنەچوون، چونکە ئەم دوو سەرۆکە گەنجە لە ڕاستیدا زۆرتر چاویان لەوە بوو گیروگرفتە ئابوورییەکانی وڵاتەکەی خۆیان چارەسەر بکەن، لەوەی چاویان لە هاوکاریی ئەم دەوڵەت و ئەو دەوڵەت بێت لە دژی عێراق.

شا عەبدوڵڵا گۆڕانکارییەکی ئەوتۆی بەسەر سیاسەتی باوکی نەهێنا لە بواری عێراقدا. بەڵام ئەوەی سوریا کەمێک لە باوکی زۆرتر بەرەو خۆشکردنی پەیوەندییەکانی چوو لەگەڵ عێراق. ڕاستە مەسەلەی ڕاگرتنی لەنگەری هێز لە ناوچەکەدا لەگەڵ ئیسرائیل لە لایەک و، تورکیا لە لایەکی دیکە، بەشێکی ڕۆیشتنی بەشار ئەلئەسەدە بەرەو عێراق. بەڵام گومان لەوەدا نییە کە بەشێکی دیکەی ئەم ڕۆیشتنە مەسەلەی گەشەکردنی پەیوەندییەکانی ئوردن و عێراقە.

واتە دیمەشق ڕەنگە پێی باش نەبێت ئەو پەیوەندییە بۆ قازانجی ئوردن گەشە بکات، کەچی سورییەکان کە خاوەنی سنوورێکی درێژترن لەگەڵ عێراق هیچیان بەر نەکەوێ.

ئەوەی ڕاستی بێت، نانەوەی ئەم پێشبڕکێیە لە نێوان دیمەشق و عەممان لایەنێکی سیاسەتی عێراقیشی تێدا بوو، چونکە تەماحی بەغدا لە ئوردن ئەوەش بوو کە لە ڕێگەی گەشەپێدانی هاوکاری لەگەڵ عەممان دەوڵەتە عەرەبییەکانی دیکە بجووڵێنەوە و بەرەو عێراق بێن، بەتایبەتی سوریا.

دیمەشق کە ماوەی بیست ساڵ پتر پەیوەندیی ناخۆش بوو لەگەڵ بەغدا، لەولای دیکەوە پەیوەندییەکی ناخۆشیشی هەبوو لەگەڵ ئوردن. بگرە ئەم

هاوبەشییە وای کردبوو بەردەوام پەیوەندییەکانی ئوردن و عێراق خۆش بێت.

گەشەکردنی پەیوەندییەکان لە نێوان ئەم دوو وڵاتەدا، بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ کەسەری خستبووە دڵی دیمەشقەوە، بەڵام تا سەرۆک (حافظ ئەلئەسەد) لە ژیان بوو، کارێکی زۆر بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەم زیانەی سوریا نەدرا. دواتر کە (بشار ئەلئەسەد) هاتە سەر حوکم دوای کۆچکردنی باوکی، سوریا کەوتە پێشبڕکێیەکی بەپەلە لەگەڵ عەمان بۆ دەستخستنی زۆرینەی قازانج لە عێراق. ڕاستە لەم نێوانەدا سوریا حسێبی ئیسرائیل و زامنکردنی کارتی عێراقی دەکرد. بەڵام بەشێکی زۆری ئەو پەیوەندییە پەیوەندیی بەوە هەبوو کە دیمەشق نەیدەویست عێراق تەنیا بۆ ئوردن بمێنێتەوە.

بۆیە سوریاش کەوتە هەوڵی پەیوەندی ئاسایی کردنەوە لەگەڵ بەغدا.

کاتێک سەرۆک وەزیرانی سوریا (مستەفا میرۆ) پێش چەند مانگێک سەردانی بەغدای کرد و پرۆتۆکۆلێکی لەگەڵ لێپرسراوانی عێراق مۆر کرد بەملیار و نیوێک دۆلار، ئوردن بەپەلە وەفدێکی گەورەی وەزاریی ڕەوانەی بەغدا کرد و بەهای پرۆتۆکۆلە کۆنەکەی لەگەڵ بەغدا دووقات کرد. دواتر کە ئەمەریکاییەکان کەوتنە هەوڵی ئەوەی بەڵکو دیمەشق قەناعەت پێ بکەن واز لەو هاوکارییە ئابوورییە بهێنێ لەگەڵ بەغدا و، پابەندی سیستەمی سزا زیرەکەکان بێت، دیمەشق ڕازی نەبوو تاکو هەر دوو دەوڵەتی تورکیا و ئوردنیش پەیوەندییە ئابوورییەکانی خۆیان لەگەڵ بەغدا ڕانەگرن. بەهەر حاڵ دیار بوو ئەو ئامانجەی بەغدا لە پێناوی تێدەکوشا بۆ بەکارهێنانی کارتی داوکاریی ئابووری لەگەڵ ئوردن بۆ ورووژاندنی سوریا و میسر سەری گرت. بگرە ئەم سەرگرتنە تا ڕادەیەک بوو کە ڕۆڵێکی گرنگی گێڕا لە بەهێزکردنی هەڵوێستی مۆسکۆ بۆ بەرپەرچدانەوەی سزا زیرەکەکان لە ئەنجوومەنی ئاسایشدا.

لە لایەکی دیکەوە، (شا عەبدوڵڵا) ویستی هەڵوێستی وڵاتەکەی لە

نێوان عێراق و ئەمەریکا و دەوڵەتانی کەنداودا بەهێز بکات، چونکە ناکرێ هەتا دوارۆژێکی نا مەعلوم ئیعتیمادی گەورەی ئابووریی ئوردن لەسەر بەغدا بێت. بۆیە یەکەم هەنگاو لە دوای هاتنە سەرکاری سەردانی سعودیە و پاشتریش سەردانی کوێتی کرد. ئەگەرچی پەیوەندییە سیاسییەکانی وڵاتەکەی لەگەڵ هەر دوو دەوڵەتدا ئاسایی کردەوە، بەڵام دیار بوو هێشتا زەحمەتی لەبەردەم بوو بۆ ئاساییکردنەوەی پەیوەندییە ئابوورییەکەی جاران.

دواتر بۆ ڕاگرتنی لەنگەر لە نێوان هەر سێ لایەندا، (شا عەبدوڵڵا) بەسترانی کۆنگرەی سەرانی عەرەبی لە عەممان لە ساڵی ۲۰۰۰دا بەهەل زانی بۆ ئەوەی هەوڵێکی دیکە بداتەوە بۆ چارەکردنی کێشە و ناکۆکییەکانی کوێت و عێراق. بێگومان (شا عەبدوڵڵا) ڕەنگە باش بزانێت کە ئەوەی بەدەوڵەتانی دیکە نەکراوە بەویش ناکرێ. هەروەها ڕەنگە بەدیقەت ئاگای لە هەڵوێستی ئەمەریکا هەبێت لە بەرامبەر عێراق و پێویستیی درێژە پێدانی سیاسەتی سزا نێودەوڵەتییەکان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە ژێر فشاری دوو سەرچاوەی ناوخۆ ناتوانێ لە بواری عەرەبی و جیهانیدا هیچ چالاکییەک بنوێنێ بەبێ بانگ ڕاهێشتن بۆ چارەکردنی کێشەکانی کوێت و عێراق بەگفتوگۆ و لە ڕێگەی سیاسەت و لابردنی سزاکان و لە هەمان کاتدا داماڵینی چەکە کۆمەڵکوژەکان لە عێراقدا.

لە کۆنگرەی سەرانی عەرەبدا تەکلیفی ئەوەی قبوڵ کرد کە لە نێوان بەغدا و کوێت هەوڵێک بدات. سەردانی کوێتی کرد، بەڵام دیار بوو زۆرتر مەبەستی باسکردنی پەیوەندییە دووقۆڵییەکان بوو لەوەی مەبەستی باسکردنی کێشەی عێراق و کوێت بێت. لێرەشدا سوورییەکان کەمێک سڵەمینەوە لەوەی دەورە عەرەبییەکەی ئوردن لەسەر حیسابی ئەوان بێت. بۆیە بەپەلە (بەشار ئەلئەسەد) سەردانی کوێتی کرد و کەوتە هەوڵی ئەوەی بەڵکو شتێک بەشتێک بکات لە نێوان عێراق و کوێتدا. بەڵام دیار بوو کوێتییەکان هەر زوو پێیان ڕاگەیاند کە ئیتر (شا عەبدوڵڵا) لەو نێوانەدا

لە کاردایە و ڕەنگە کارێکی باش نەبێت باز لەسەر هەوڵەکانی ئەو بدرێ و، وا چاکە عەرەب چاوەڕێی ئەنجامی هەوڵەکانی ئەو بن.

بەڵام (شا عەبدوڵڵا) کە پێشتر دژی سزا زیرەکەکان قسەی کردبوو، هەروەها بەئاشکرا داوای لابردنی ئازارەکانی سەر خەڵکی عێراقی کردبوو، سەرباری ئەمانە چەندین وەفدی وەزاری؛ تەنانەت یەکێکیان بەسەرۆکایەتیی سەرۆک وەزیرانی ڕەوانەی بەغدا کردبوو، نەیدەویست ئەوەی لەگەڵ بەغدا بەدەستی هێناوە لە دەستی بدات، هەر نەبێت هەتا ئاسایی بوونەوەی پەیوەندییە ئابوورییەکانی لەگەڵ دەوڵەتانی کەنداو. هەروەها دەیویست خەڵکی ئوردن لە ڕووی خۆی بورووژێنێ لە کاتێکدا عەممان ڕووبەڕووی دەیان گیروگرفتی بێ ئاوی و بێ نانی بۆتەوە و، تا ئێستا پرۆسەی ئاشتییەکەی لەگەڵ ئیسرائیل هیچ بەروبوومێکی ئەوتۆی پێ نەبەخشیوە.

لە هەمان کاتدا (شا عەبدوڵڵا) دەزانێ کە یەک لە پایگا گرنگەکانی مانەوەی وڵاتەکەی لەناو ئەو سێگۆشە ناسکەی نێوان سوریا و ئیسرائیل و عێراق، هاوپەیمانێتییە ستراتیژییەکەیەتی لەگەڵ ئەمەریکا و وڵاتانی ڕۆژئاوا، بۆیە هەر چەند فشاری ناوەوە زیاد بکات بۆ ڕۆیشتن بەرەو عێراق، ئەو هێندە بۆشاییەکە لەو نێوانەدا دەهێڵێتەوە کە زیان بەهاوپەیمانێتییەکەی لەگەڵ ئەمەریکا نەگات. لەم نێوانەشدا ڕەنگە ڕاگرتنی لەنگەر کارێکی زەحمەت بێت، بەڵام ئەوەی کارەکەی بۆ (شا عەبدوڵڵا) ئاسان کردووە ئەوەیە کە بەردەوام پەیوەندییەکانی وڵاتەکەی لەگەڵ عێراق هەمیشە گیزبووکەیەکی ڕق و بەرژەوەندی بووە و، لەم نێوانەدا ئەوەی پێویستە وەکو خۆی بمێنێتەوە هاوپەیمانێتیەکەیەتی لەگەڵ ئەمەریکا و ڕۆژئاوا.

## عێراق و سوریا
## ئەو بەعسەی نابێ بەیەک

پەیوەندییەکانی بەغدا و دیمەشق هەتا ڕادەیەکی زۆر لەگەڵ پەیوەندییەکانی عێراق بەدەوڵەتانی دیکەی دەوروپشتیەوە جیاوازن.

ئەم دوو وڵاتە هاوسێیە، ئەگەرچی لە تەک میسر پێشەنگی بزووتنەوەی نەتەوەیی عەرەبیان پێک هێنابوو بەدرێژایی چل ساڵ، بەڵام لە ڕاستیدا حاڵەتی لەیەک دابڕان و ناکۆکی و بەیەک نەگەیشتن لە نێوانیاندا زاڵتر بووە لە هەموو پەیوەندییەکی دۆستانە.

لەم نێوانەدا حزبی بەعس کە بەشێکی زۆری دیمەنە مێژووییە سیاسییەکەی ئەم دوو وڵاتە پێک دێنێت، لە جیاتی ئەوەی فاکتەری لەیەک نزیککردنەوە بێت، زۆرتر فاکتەری لەیەک دابڕاندن و چەقۆ لەیەکدی تیژکردنەوە بووە.

لەم چەند ساڵەی دواییدا بەهۆی هەلومەرجی گەمارۆدانی عێراق لەلایەک و سەختییەکانی بەردەم سوریا بەهۆی تورکیا و ئیسرائیلەوە لەلایەکی دیکە، هەتا ڕادەیەک ڕێگە لەبەردەم جۆرە نزیکبوونەوەیەک دەگرێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا بەعس دوو بەعسە و، هێشتا دەماری نەتەوەیی لە جیاتی یەکخستن دووریان دەخاتەوە: ئەمیان لە ترسی ئەوەی نەوەکا دیمەشق هەلومەرجە سیاسی و ئابووری و سەربازییە لاوازەکەی عێراق بقۆزێتەوە و گورزێکی کوشندەی لێ بوەشێنێ، ئەویشیان لە ترسی ئەوەی نەوەکا نزیککەوتنەوە لە بەغدا، واشنتۆن و دەوڵەتانی کەنداوی لێ تووڕە بکات، بەتایبەتی سعودیە و کوێت کە دوو دەوڵەتی لە پێشەوەی یارمەتیدانی سوریان.

لەولایشەوە کە شانۆ هێور دەبێتەوە و تەپوتۆزی شەڕ دەڕەوێتەوە، لە پڕ بۆیان دەردەکەوێ کە نەک بەعسیایەتی؛ بەڵکو عەرەبایەتی یەکیان

دەخات، بەڵام چونکە هەردوولا هەموو جیاوازییەکیان لە نێوان عەرەبایەتی و بەعسیایەتیدا سڕیوەتەوە، بۆیە ناتوانن تخوومەکانی لێکترازان و بەیەکگەشتن لە نێوان خۆیاندا بدۆزنەوە.

ناکۆکییەکانی سوریا و عێراق بەشێکی گرنگی دیمەنی سیاسیی مێژووی هاوچەرخی عەرەب پێک دێنن، سوریا عێراقی ویستووە بۆ ڕاستکردنەوەی لەنگەرەکانی لەگەڵ ئیسرائیل و تورکیا، بەڵام عێراق سوریای ویستووە بۆ ڕاستکردنەوەی لەنگەرەکانی لەگەڵ ئێران و دەوڵەتانی کەنداو، هەروەها لەگەڵ میسر. سوریا عێراقی ویستووە بۆ یارمەتیدانی لە شەڕە دەرەکیەکانیدا، بەڵام عێراق سوریای ویستووە بۆ یارمەتیدانی لە شەڕە ناوخۆییەکانی. لەو نێوانەدا ئابووری و دەوڵەمەندیی عێراق بابەتێک بوو لە بابەتەکانی سوریا، بەڵام بەهۆی ئەو یارمەتییە بێ پایانەی دیمەشق لە وڵاتانی کەنداوی وەرگرتووە، پێویستییەکی ئەوتۆی لە لا نەهێشتۆتەوە بۆ چاوبڕینە ئابوورییەکەی عێراق. لەم دواییەش کە هەندێ هاوکاریی ئابووری لەگەڵ عێراقدا دەکات، زۆرتر بەهۆی ناکۆکییە دەرەکییەکانێتی لەلایەک لەگەڵ ئیسرائیل و لەلایەکی دی لەگەڵ ئوردن.

لەم تەوەرەدا، سوریا ئابوورییەکی هەژاری هەبوو، بەڵام لە کەلتووری نەتەوەیی عەرەبیدا دەوڵەمەند بوو. عێراق بەپێچەوانەوە ئابوورییەکی دەوڵەمەندی هەبوو، بەتایبەتی لە نەوت، بەڵام لە کەلتووری نەتەوەیی عەرەبیدا کڵۆڵ بوو. چوست و چالاکییەکانی لەم بوارەدا زۆرتر ڕەنگدانەوەی سوریا و میسر و فەلەستینییەکان بووە.

ئەویان ئامادەبوو کەلتووره عەرەبییەکەی خۆی لەپێناو پەیداکردنی قازانجی ئابووری بەکاربهێنێ، بەتایبەتی لەگەڵ دەوڵەتە عەرەبییەکان و میرنشینەکانی کەنداودا. کەچی ئەویان لە پێناو کەڵەکەکردنی کەلتوور و شکۆمەندیی نەتەوەیی و وەرگرتنەوەی جڵەوی بزووتنەوەی سەرکردایەتیکردنی عەرەب لە دەست میسر و سوریا، هەرچی ئابووری و دەوڵەمەندیشی هەبووە فەوتاندوویەتی.

بەڵام سەیر ئەوەیە لەم نێوانەدا، نە دیمەشق بەتێروتەسەلی نانی دەسکەوتووە و، نە بەغداش وەک خواستوویەتی ئەو شکۆمەندییە نەتەوەییبیەی پێ براوە!

## ئاوڕێک لە سەرەتاکان

بەرلەوەی هەردوو دەوڵەتی عێراق و سوریا دابمەزرێن، هەردووکیان چەند ویلایەتێکی سەر بەدەوڵەتی عوسمانی بوون. لەو سەردەمە کۆنانەدا ئەگەر والییەکانی بەغدا توانیبێتیان لە ڕێگەی چەند وردە ڕیفۆرم و پشت بەستنێکیانەوە بەزۆرینە سونییەکەی بەغدا تەباییەک لە نێوان ئەستەمبول و عێراقی کۆنینە دروست بکەن، ئەوا خۆ زوڵم و زۆرداریی والییە خوێنڕێژەکانی عوسمانی لە دیمەشق و حەلەبی کۆندا نەک هەر نێوانی ئەستەمبوول و سوریای کۆن و تازەی تێک داوە، بگرە ڕق و کینەیەکی ئەستووریشی خستۆتە نێوان بەغدا و دیمەشقیشەوە.

لەوە بەولاتر، ناکۆکییەکانی دیمەشق و ئەستەمبول لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا ڕێگەی خۆش کرد لەناو سورییەکاندا هەر زوو بزووتنەوەیەکی توندی عەرەبایەتی دروست بێت لە بەرامبەر تورکایەتیی عوسمانییەکان. کەچی لە عێراقدا خولقانی ئەو بزووتنەوە عەرەبایەتیە ڕەنگە کارێکی زەحمەت بووایە ئەگەر کارتێکردنەکانی سوریا و لوبنان نەبوونایە. عێراق زۆرتر لە سەرەتای سەدەی بیستدا گیانی عێراقچێتی و نیشتمانیی تیادا زاڵ بووە لەوەی گیانی عەرەبی. جێگەی سەرنجە هەتا ئەو ئەفسەرە عەرەبیە عێراقیانەی پەیوەندییان بەراپەڕینەکەی میری حیجاز کرد لە دژی عوسمانییەکان لە سەرەتای سەدەی بیستدا و زۆرتر چاویان لە عێراق بوو لەوەی چاویان لە عەرەب بێت. هەروەها خوازیاری ئەوەبوون میری حیجاز یارمەتییان بدات بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی هاوچەرخ بۆ عێراق. دواتر ئەم ئاواتەیان هاتە دی، بەڵام نەک لەسەر دەستی میری حیجاز، بەڵکو لەسەر دەستی ئینگلیز.

خۆ ئەگەر لە سەردەمی عوسمانییەکاندا ئیسلام لە پێشەوەی نەتەوە

حسێبی بۆ کرابێ، لەناو سورییەکاندا هەر زوو ئیسلام تەواوکەری نەتەوە بووە، بگرە هەندێ جـار پاشکۆی نەتەوە بووە. هەن ئەم دیاردەیە بەوە لێکدەدەنەوە کـە سـەرانی بزووتنەوەی نەتەوەیی تازەی عـەرەب لەو سەردەمەدا زۆرتر لەناو مەسیحییەکانی سوریا و لوبنانەوە سەریان هەڵدا، بەڵام ڕەنگە نموونەی عەبدولڕەحمانی کەواکبی ئەم بۆچوونە ڕەت بکاتەوە، چونکە کەواکبی کە دواتر عوسمانیەکان گرتیان و بۆ میسریان دوورخستەوە و لەوێ لە ساڵی (١٩٠٢)دا کوشتیان، لە ئیسلامەوە دەستی پێکردبوو. کەچی بەوە تەواو ببوو دەربازکردنی عەرەب لە تەوق و پێوەندی عوسمانی بەئەرکی گرنگ و سەرەکی بزانێ کە ئیسلام دەبێت یاریدەدەری ئەم ڕزگارکردنە نەتەوەییە بێت.

ئەم ناکۆکییە توندەی نێوان دیمەشق و ئەستەمبوول ڕەنگە لە شێوازی دەرەوەیدا کەمتر ڕەنگی لەسەر پەیوەندییەکانی عێراق و سوریا ڕشتبێ، بەڵام لە شێوازەکانی ناوەوەیدا بەخەستی ڕەنگی داوەتەوە؛ ئەگەرچی لێرەدا قەوارەیەکی جیاوازتری گرتۆتە خۆ. لەم نێوانەشدا جێگەی سەرنج ئەوەیە کە عێراق بۆ سورییەکان هەمیشە نموونەیەکی تورکی بووە هەرچەند زۆرینەی عەرەبی عێراق شیعەن. کەچی عێراق هەمیشە تەماشای سوریای کردووە وەک پارچەیەک لە ئێران ئەگەرچی سوننە لە سوریادا زۆرینەی وڵاتەکە بوون.

ڕاستە، دواتر ئینگلیز لە بەغدا و فەرەنسییەکان لە دیمەشق و بەیروت کەلتوورێکی سیاسیی جیاوازیان دارشت. ئینجا کێشەی سنوور و ناکۆکییەکان، شەڕ و مۆزاییکی ناوچە، ناکۆکییەکانی نێوان ئیسرائیل و فەلەستینییەکان، ڕەنگێکی تەڵختری بەسەر پەیوەندییەکانی بەغدا و دیمەشق ڕشت، بەڵام لەگەڵ ئەو ڕاستیانەشدا، هێشتا هەر کەلتووری ناکۆکی و پێکدادان کە حزبی بەعس لەناو بزووتنەوەی تازەی نەتەوەیی عەرەبدا هێنایە کایەوە ڕۆڵێکی کاریگەرتری بینی لە شەقکردنی نێوان دیمەشق و بەغدا. بۆیە لەبەرچاو گرتنی تاقیکردنەوەی بەعس لەم دوو

وڵاتەدا مـەودایەکی زەمـەنیی لەبارمـان دەخـاتە بەردەم بۆ وردبوونەوە و تێگەیشـتنی ڕەوتی پەیوەندی و ڕووداوەکـانی ئەو ناوچە گـرنگەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

پێش بەعس، کاتێک ئینگلیزەکان بەرەزامەندیی پاریس میر فەیسەڵیان لە (١٩١٩)دا لە دیمەشق کـرد بەپادشـا، هێـشـتـا سـوریا و عـێـراق ناکـۆکـیـەکی ئەوتۆیان لە نێـواندا نەبوو، غـەیری یادگـارە تەڵخەکـانی عەباسییەکان و ئەمەوییەکان، بەڵام دواتر کە خەڵکی سوریا بەفەیسەڵ ڕازی نەبوون و دەریان پەڕاند بۆ عـێـراق، ئەو کـەسـەرە لە نێـواندا مـایەوە بەتایبەتی بەشێک لەو ئەفسەرانەی یاریدەدەری فەیسەڵ بوون لە سەردەمی سوریا، عێراقی بوون و لەگەڵ ئەو سەری کۆچیان هەڵگرتبوو.

دواتر ئەم ناکۆکیانە قابیلی تاوسەندنێکی گەورە بوون بەتایبەتی بەهۆی ناکۆکییەکانی سنوور لە ناوچەی ئەلبوکەمال و دێرئەلزوور.

بەڵام تەقینەوەی ناکۆکیەکان لە نێوان بەغدا و ئەنقەرە لەسەر ویلایەتی مـوسڵ و ناکـۆکـیـەکـانی نێـوان دیمەشق و ئەنقـەرە لەسـەر ویلایەتی ئەسکەندەروونە هەتا ڕادەیەک تەڵخییەکانی نێوان عێراق و سوریای هێور کـردەوە. ئەوەی زۆرتریش یارمـەتیی ئەو هێـورکـردنەوەیەی دا بەریتـانیـا و فـەرەنسـا بوون کـە هەر یەکـەیان وڵاتێکیـان لەو دوو وڵاتە بەڕێوە دەبرد و پێـیـان وابوو بەردەوامـبـوونی ناکـۆکـیی دیمەشق و بەغـدا کـار لە پەیوەندییەکانی ئەوان دەکات.

دواتر لە عـێـراقـدا بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی عـەرەبی گـەڵاڵەی کـرد، بەتایبەتی پێش هەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیهانیی. لێپرسراوانی عێراق سەرچاوەی ئەم بزووتنەوەیەیان بەدیمەشق دەزانی. بۆیە هەتا ڕادەیەک خۆیان لە سوریا دەکێشایەوە، بەتایبەتی کە سوریا بەپێچەوانەی عێراق و ئوردن خاوەنی ڕژێمێکی پادشایەتی نەبوو.

سـاڵی ١٩٤١ سـورییـەکـان، بەتایبـەتی نەتەوەخـوازەکـانی ئەو وڵاتە ڕۆڵێکی زۆریان هەبوو لە پشتگیری و هاندانی ڕاپەڕینەکەی ڕەشید عالی

گەیلانی لە بەغدا. دواتر کە جەنگی جیهانیی کۆتایی هات لە سوریادا دەرگا لەبەردەم پەرەسەندنی شالاوێکی نەتەوەیی عەرەبی گەورەدا کرایەوە. یەک لە نموونەکانی ئەو شالاوە ئەوە بوو لە تەمووزی ١٩٤٥ میشیل عەفلەق و مەدحەت بەیتار یاداشتێکیان ئاراستەی وەزارەتی ناوخۆی سوریا کرد بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی دامەزراندنی ڕێکخراوێکی نەتەوەیی.

شایانی باسە دواتر ئەو پەیڕەو و پرۆگرامەی لەم یاداشتە هاتبوو بوو بەپەیڕەو و پرۆگرامی ئەو حزبی بەعسەی لە نیسانی ١٩٤٧ لە دیمەشق دامەزرا.

عێراق ئەم چالاکییە سیاسیانەی سوریای بەدڵ نەبوو، بەتایبەتی کە بەغدا تووشی شالاوێکی کاریگەری بزووتنەوەی کۆمۆنیستی بوو.

دواتر ئەوەی مەترسییەکانی بەغدای لە ئاست سوریا زۆر زیاد کرد ئەو کودەتا عەسکەریانە بوون کە لە یەک ساڵدا (ساڵی ١٩٤٩) لە دیمەشق ڕوویان دا: کودەتای حوسنی ئەلزەعیم، ئینجا کودەتای سامی ئەلحەناوی و دواتریش کودەتای ئەدیب ئەلشیشکلی.

بەغدا تا دەهات ترسێکی زۆرتری لەو بزووتنەوە نەتەوەییە پەیدا دەکرد، بەتایبەتی پاش کودەتاکەی جەمال عەبدولناسر لە قاهیرە لە ١٩٥٢ و ئینجا لابردنی ڕژێمە پادشایەتییەکەی.

ئەم هەلومەرجە تازەیە دەرفەتی گەشەسەندنێکی زۆری لەبەردەم دیمەشق و قاهیرەدا کردەوە. لە ساڵی ١٩٥٦ەوە، بەتایبەتی دوای شەڕی سویس، کەوتنە گفتوگۆی دروستکردنی یەکگرتنێکی تەواو لە نێوان میسر و سوریادا. لەوە بەولاتر بەعسیەکان و ناسریەکان دەسەڵاتێکی زۆریان لە سوریا پەیدا کرد. ئەوەبوو ئەکرەم حۆرانی بووە سەرۆکی پەرلەمان و عەقید عەبدولحەمید سەرراج کە ناسراوترین ئەفسەری ناسری بوو لە سوریا بوو بەلێپرسراوی دەزگای ئیستیخباراتی سوریا.

ڕاست لەم کاتەدا لە عێراق ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ ڕووی دا.

هەروەها وا چاوەڕێ دەکرا لەم ڕووداوە گەورەیەی ناو عێراق کە ببێتە مایەی خۆشبوونی پەیوەندی لە نێوان سوریا و عێراق، بەڵام بەپێچەوانەوە زۆری نەبرد نێوانەکەیان تێکچووە بەتایبەتی دوای کودەتاکەی (عەبدولوەهاب ئەلشەواف) لە موسڵ ساڵی ١٩٥٩.

عەبدولکەریم قاسم پێی وابوو نەک تەنیا میسر، بەڵکو سوریاش دەستی گەورەی لەم کودەتایە هەبوو.

هەردوو وڵاتەکە لە نێوان ١٩٦٠ و ١٩٦٣ تووشی قەیرانی ناوخۆ هاتبوون و، بەوە ڕانەدەگەیشتن ئاوڕ لە ناکۆکیەکانیان بدەنەوە، بەڵام دواتر زۆری نەبرد لە ساڵی ١٩٦٣ لە هەر دوو وڵاتدا بەعس توانی لە ڕێگەی کودەتای سەرکەوتووەوە بگاتە سەر تەختی فەرمانڕەوایەتی لە دیمەشق و بەغدادا. ئەم دوو کودەتایە لە هەندێ ڕووەوە هاوکارییەکی تازەی لە نێوانیاندا دروست کرد، یاریدەدەرانی لەشکری عێراق لە ڕووبەڕووبوونەوەی شۆڕشی کورد. بەڵام ئەم هاوکاریە زۆری نەخایاند بەهۆی تەقینەوەی ناکۆکیە ناوخۆییەکانی ناو بەعس. ئەم ناکۆکیانە ڕێگەیان خۆش کرد بۆ کودەتاکەی (عەبدولسەلام محەمەد عارف) لە تشرینی دووەمی ١٩٦٣، کە ئیتر دیار بوو بزووتنەوەی عەرەب لە عێراق بڕیاری دابوو بەرەو ناسر و میسر بڕوات لە جیاتی دیمەشق و بەعس.

## بەعس لە نێوان سوریا و عێراقدا

بزووتنەوەی نەتەوەیی عەرەبی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا بەشێوەیەکی تازەتر خۆی نواند. ئەو خۆنواندنە زۆرتر لە سوریا بوو، ئینجا میسر.

لەو کاتەدا عەبدولڕەحمان کەواکبی ڕێچکەیەکی ئیسلاحکارانەی بۆ ئەو بزووتنەوەیە داڕشتبوو. کەواکبی لە ڕێگەی هەردوو کتێبە بەناوبانگەکەی (أم القرى) و (طبائع الاستبداد) ڕەنگی عەرەبایەتیی لە بزووتنەوە ئیسلامییەکەی خۆی زەق کردبۆوە پێی وابوو عەرەب لە تورک شایستەترن

بۆ خیلافەتی موسڵمانان. دواتر لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، کوشتنی کەواکبی ڕێگەی خۆش کرد لەبەردەم بزووتنەوەیەکی فراوانتر کە زۆربەی دەرووپشتی دەوڵەتی عوسمانیی گرتبووەوە. لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی، (بطرس البستانی) و (ساطع الحصری)، ئینجا، (انطوان سعادة) و (زکی الاسوزی) و (میشیل عەفلەق) و (قسطنطین زریق) نوێنەرانی ئەو بزووتنەوە تازەیە بوون.

بەر لەوەی ئەم دەستە خوێندکارە ڕێگە بۆ بزووتنەوەی نەتەوەیی عەرەبی لە دیمەشق خۆش بکەن، سوریا لە سەرەتای بوونی بەدەوڵەت لە بیستەکانی سەدەی ڕابردوودا، زنجیرەیەک ڕاپەڕینی بەخۆیەوە دیبوو. بەناوبانگترینی ئەو ڕاپەڕینانە (میسلون) ۱۹۲۰ و شۆڕشی دورزیەکان بوو لە ساڵی ۱۹۲۵. لەم ماوەیەدا فەیسەڵی یەکەم کە ئینگلیزەکان بەپاشای سوریایان دانابوو، لە تەخت دەرکرا و ئینگلیز ناچار بردیان لە بەغدا کردیانە پادشا. زۆری نەبرد وڵاتەکە بەلوبنانەوە کەوتە بەر دەسەڵاتی فەرەنسیەکان. ئەم کەینوبەینە تا دەهات درزی نێوان سوریا و عێراقی لەناو واقیعی حاڵدا قووڵتر دەکرد، بەڵام لەولاوە نەتەوەخوازەکان سەرقاڵی لەیەک نزیککردنەوەی ئەم دوو وڵاتە تازەیە بوون. بەڵام حەسرەتی فەیسەڵی یەکەم لەو دەردەی بەدەست سوریەکان دیبووی ڕێگری ئەم جۆرە نزیکبوونەوەیە بوو.

لە کۆتایی بیستەکاندا سیاسەتمەدارانی عێراق، بەهۆی کەلتووری عوسمانی و دواتریش ڕۆشنبیریی ئینگلیز خەریکی دروستکردنی جومگەکانی دەوڵەت و فەرمانڕەوایەتی بوون و زۆرتر چاویان لەسەر زیانی مادیی دەوڵەتەوەبوو. لەولاترەوە، سیاسەتمەدارانی دیمەشق بەتایبەتی لە نێو نەتەوەخوازەکاندا زۆرتر خەریکی خوێندنەوە و تەرجەمەکردنی کتێبەکانی (نیتشە) و (فیختە) بوون و پێیان وابوو لەم ڕێگەیەوە دەتوانن سەرەداوەون بووەکەی نەتەوەی عەرەب بدۆزنەوە.

حزبی بەعس لە نیسانی ۱۹٤۷ لە ژێر ناوی حزبی بەعسی عەرەبی

دامەزرا. سێ کەس دامەزرێنەرانی ئەو حزبە بوون:

میشیل عەفلەق (مەسیحی)، زەکی ئەلئەرسوزی (عەلەوی)، سەلاحەدیین بەیتار (سوننی). هەرسێکیان لە فەرەنسا خوێندبوویان و لەوێ ئاشنایەتیان لەگەڵ بیروباوەڕی نازی و فاشیزمی ئەڵمانی و ئیتاڵی پەیدا کردبوو. لە ساڵی (١٩٥٣-١٩٥٤) لەگەڵ حزبی سۆسیالیستی ئەکرەم ئەلحورانی یەکیان گرت. لە ١٩٥٢دا لە ڕێگەی ئەو قوتابیە عێراقیانەی لە بەیروت دەیان خوێند پەلوپۆی حزبەکەیان گەیاندە عێراق. لە ڕاستیدا چەند هۆیەک زەمینەی هاندەری لەبەردەم ئەو هەڵکشانەی بەعس بۆ عێراق خۆش کرد.

یەکەم: موفتیی قودس ئەمین ئەلحوسێنی لە ڕێگەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ نازیەکان تا دەهات دنەی بیروباوەڕی نەتەوەیی عەرەبیی دا لە عێراق. لەو بوارەدا چەندین مامۆستا و خوێندکاری فەلەستینی یاریدەیان دەدا.

دووەم: ساطع ئەلحوسری کە بەڕەچەڵەک سوری بوو، بەرنامەیەکی پەروەردەیی ئەوتۆی لە عێراقدا دەچاند بۆ ڕێگەگرتن لە دەسەڵاتی شیعە، کە ڕێگەیەکی فراوانی لەبەردەم بڵاوبوونەوەی بزووتنەوەی عەرەبی خۆش دەکرد.

سێیەم: کودەتاکەی بەکر سدقی لە ١٩٣٦ ئەگەرچی بەلای هەندێ لێکۆڵەرەوە خەریکی ڕێگە خۆشکردن بوو بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردستان، بەڵام لە ڕاستیدا بزووتنەوەی عەرەبی لە عێراق و سوریا و تەواوی جیهانی عەرەبیدا بەوە فێرکرد کە کودەتا و بەکارهێنانی هێز و دەست بەکاربوونی لەشکر لەناو سیاسەتدا ڕەنگە چارەیەکی جێگەی سەرسوڕمان نەبێت کە بەکر سدقی خۆی بەدەست ئەو بزووتنەوەیە کوژرا لە موسڵ.

چوارەم: ڕاپەڕینە نەتەوەییەکەی چوار ئەفسەرە نەتەوەخوازەکەی عێراق لە مایسی ١٩٤١دا پردێکی بەهێزی لە نێوان بزووتنەوەی عەرەبی لە

سوریا و عێراقدا دامەزراند و ڕێگەی بۆ هاتنەکایەی حزبی بەعس تەخت کرد.

ڕاپەڕینی ئەفسەرە نەتەوەییبیە عەرەبەکان کە ڕەشید عالی گەیلانی ڕووە سیاسیەکەیان بوو لە مایسی ١٩٤١ دەنگێکی زۆری لەناو بەعسییەکانی سوریا دایەوە. بگرە چەندین کەس لەوانە ئەکرەم ئەلحۆرانی خۆی ناونووس کرد بۆ پشتگیریی عێراق و، ڕاپەڕینەکەیانی بەشۆڕشی ڕزگاریخوازی یەکەمی عەرەب لە قەڵەم دا.

لە ڕاستیدا، ئەم ڕاپەڕینە دەورێکی باڵای هەبوو لە گەڵاڵەکردنی بیروباوەڕی بەعس لە سوریادا. ڕەنگە جێگەی خۆی بێ ئیشارەت بەوە بدەین کە سوێندی گەنجە نەتەوەییبیەکانی ئەوسای سوریا، کە دواتر بەعسیان لێ پێک هات ئەوە بوو:

(خودایە تۆ ویستت عەرەب نەتەوەییبیەکی یەکگرتوو و بەهێز و ڕێگە نیشاندەر بێت و پەیامت بەرێ بۆ جیهان، ئەو نەتەوەیە ئەمڕۆ دەیەوێ یەکیەتییان و هێزیان بۆ بگێڕێتەوە تا پەیامەکەت تا سەر بەرن، خودایە ئەو هێزەی ئیمان و ڕوونی بیرو ئەو توندیەی خواستم بدەرێ کە بتوانم سەربازێکی بەکەڵک و کاریگەری ئەم جیهادە بم کە عێراق لە پێناو یەکگرتنی عەرەب دەیکات).

هەروەها ئەم لاوانە سوێندیان بەوە دەخوارد کە هەموو توانستێکی خۆیان لە پێناو عێراق بخەنە گەڕ. لە ماڵی هەر یەکێکیاندا ئاڵایەکی عەرەبی و سەندووقێک هەبوو بۆ پاشەکەوت کردنی پارە و ناردنی بۆ ڕاپەڕینەکەی ڕەشید عالی گەیلانی.

دواتر هەردوو حزبی بەعسەکەی عێراق و سوریا لە ساڵی ١٩٦٣ هاتنە سەر حوکم. بەڵام زۆری نەبرد ئەوەی دیمەشق کەوتە ناکۆکی لەگەڵ عەفلەق. هەندێک لە دەست و پێوەندەکانی گیران.

هەندێکی دیکە ڕایان کرد بۆ بەیروت. لەوانە عەفلەق خۆی بوو کە چوو

بۆ لوبنان. دواتر جیاوازییەکان لە ١٩٦٦ بەشێوەیەکی گەورەتر تەقینەوە، کاتێک سەلاح جدید و ئیبراهیم زعیین لە شوباتی ئەو ساڵەدا کۆنگرەی نۆیەمیان لە دیمەشق بەست عەفلەقیان دەرکرد، کەچی بەعسیە عێراقیەکان پشتیان گرت و کۆنگرەیەکی دیکەیان بەناوی کۆنگرەی نۆ لە بەیرووت بەست لە شوباتی ١٩٦٨.

پێش ئەم ڕووداوە بەعسییەکانی عێراق بەسەرسامییەوە گوێیان لە دووبەرەکییەکەی دیمەشق بوو، بۆیە پێی ڕازی نەبوون. سوریەکان لیژنەیەکی تایبەتیان بۆ عێراق لە دیمەشق دامەزراند و ناویان نا لیژنەی ڕێکخستنی هەرێم (قطر) و ئەندامانی لیژنە هەرێمیەکەی عێراقیان دەرکرد. ئەمانە کۆبوونەوەیەکی تایبەتیان کرد و کەوتنە دوژمنایەتی کردنی سەرکردایەتیەکەی دیمەشق. لەگەڵ عەفلەق پەیوەندییان بەست، بەڵام لەگەڵ ئەوەش عەفلەق سەردانی بەغدای نەکرد هەتا ساڵی ١٩٧٠. ئەویش لە کاتێکدا بوو کە بەربەرەکانیی نێوان بەعس و عەبدولناسر لە پۆپەی بوو. هەروەها لەو ماوەیدا چاوەڕێی ئەوەی دەکرد گۆڕانکاریەک لە ناو بەعسی دیمەشق ڕوو بدات. لە ڕاستیدا گۆڕانکاریەکە ڕووی دا، بەڵام لە دژی خواستی ئەو بوو، کاتێک (حافظ ئەلئەسەد) هاتە سەر حوکم و ئاوڕی لە عەفلەق نەدایەوە و درێژەی بەرێچکەی سەلاح جەدید دا لەو بارەیەوە. ئیتر ئەوە بوو عەفلەق بەناچاری خۆی لەگەڵ بەغدا ساغ کردەوە و بەیەکجارەکی ڕووی لە بەغدا کرد.

لە ڕاستیدا، ناکۆکیەکانی بەعسی دیمەشق و بەعسی بەغدا خاڵی نەبوو لە ناوەڕۆکێکی مەزهەبی. لە سوریا هەر لە سەرەتاوە عەلەویە بەرەچەلەک شیعەکان لە ژێر فشاری هەستی کەمینێتی ڕوویان لە چوونە ناو ڕیزی سوپای سوریا کردبوو. ئەوانەی سوریا پاش هەڵکشانیان بۆ ڕیزی لەشکر ڕوویان لە حزبی بەعس کرد بەتایبەتی یەک لە دامەزرێنەرانی ئەو حزبە (زەکی ئەرسوزی) عەلەوی بوو. دواتر توانیان بەرەو ڕیزەکانی پێشەوەی بەعس بچن و بتوانن لەم ڕێگەیەوە دەست بەسەر فەرمانڕەوایەتیی سوریا بگرن.

بەڵام لە عێراقدا کارەکە بەپێچەوانەبوو. ڕێگە لەبەردەم کەمینە نەتەوەیی و مەزەبییەکان هەتا ڕادەیەکی زۆر گیرابوو لەوەی بچنە ڕیزی ئەفسەرایەتی لە سوپادا. بۆیە شیعەکانی عێراق لە پێناو پەیداکردنی دەسەڵاتی سیاسی، زۆرتر ڕوویان لە دوو حزبی ئۆپۆزیسیۆن کرد: کۆمۆنیستی و بەعس. ئەوەی یەکەم دیار بوو دەرفەتی هاتنە سەر حوکمی نەبوو، بەڵام هی دووەم، واتە بەعس، بەهۆی ئەوەی بەعسییەکانی ناو سوپا هەموو سونی بوون، بۆیە وردە وردە ڕیزەکانی بەعس لە ئەندامە سەرکردایەتیە شیعییەکان پاک کرایەوە، دوا قەلاچۆکردن خنکاندنی محی مەشهەدانی و عەدنان ئەلحەمدان و شیعەکانی دیکە بوو. لە ساڵی ١٩٧٩.

رووگەیەکی دیکەی ئەو ناکۆکییە مەزەبییە، شەڕی عێراق و ئێران و هەڵوێستی سوریا بوو. لەو شەڕەدا دیمەشق پێویستیی بەکاتێکی زۆر نەبوو بۆ ساغکردنەوەی هەڵوێستی خۆی لەبەرامبەر ئەم شەڕە و پشت گرتنی ئێران لە ڕووی عێراق. ڕاستە ناکۆکیە سیاسیەکانی نێوان بەغدا و دیمەشق هاندەری سەرەکی بوون بۆ ئەم هەڵوێستەی سوریا، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت فاکتەری مەزەبیش دەورێکی گەورەی بینی.

لە سەرەتای حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا، بەغدا تووشی ناکۆکییەکی گەورە هاتبوو لەگەڵ تاران. لەو بەرامبەرەدا دیمەشق چەندین ناکۆکیی گەورەی لەگەڵ تاران هەبوو بەهۆی هەڵوێستی پشتگیرانەی سوریەکان بۆ فەلەستینییەکان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دیاربوو درزەکانی نێوان بەغدا و دیمەشق لەوە گەورەتر بوون مەسەلەیەکی وەکو ئێران چارەسەریان بکات.

## دوو هەوڵی بێ ئەنجام

بەر لە بەرپابوونی شەڕی ئێران لە ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٠، بەغدا و دیمەشق دووجار هەوڵی بەیەک گەیشتنەوەیان دابوو:

یەکەم- کاتێک شەڕی ئۆکتۆبەر لە ١٩٧٣ لە نێوان ئیسرائیل لەلایەک و میسر و سوریا لەلایەکی دیکە بەرپابوو. لەو کاتەدا عێراق ٥٠٠

دەبابەی ڕەوانەی بەرەی شەڕ کرد لە سوریا، بەڵام لەگەڵ یەکەم وەستانی تەقەدا تانکەکانی کێشایەوە بەو بەهانەیەی کە گوایە بەغدا ڕازی نییە بەبڕیاری ۳۳۸ کە شەڕی پێ ڕاگیرابوو. زۆری نەبرد عێراق لە ژێر فشاری ئێران لەلایەک و شۆڕشی کورد لەلایەکی دیکە، لە ئاداری ۱۹۷۵ لەگەڵ تاران ڕێککەوت.

ئەمەریکاییەکان و ئیسرائیلیەکان ئەم ڕێککەوتنەی بەغدا و تارانیان پێ باش بوو. بەڵام سوریا زۆر بەتوندی لە دژی وەستا، چونکە دەیزانی ئامانجە سەرەکیەکەی ئەم ڕێککەوتننامەیە ئەوەیە عێراق دەست بەتاڵ بکرێ بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سوریا و دروستکردنی گێچەڵ و سەرئێشە بۆی.

دیاربوو لێکدانەوەکەی دیمەشق ڕاست دەرچوو، چونکە زۆری نەبرد. لە ساڵی ۱۹۷٦، عێراق لەشکری کێشایە سەر سنووری سوریا و بۆڕیە نەوتی نێوان هەردوو وڵاتی ڕاگرت.

دووەم- کاتێک جێگری سەرۆکی ئەنجوومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش، (ئەوسا) سەدام حوسێن سەردانی دیمەشقی کرد و پاشتریش سەرۆکی کۆماری سوریا (حافظ ئەلئەسەد) هاتە بەغدا. ئەم هەوڵە زۆر بەرفراوانتر بوو لەوەی یەکەم،، چونکە ئاسۆی سیاسیشی تێدابوو.

هۆیە سەرەکیەکانیشی چەند خاڵێک بوون: دیمەشق دەیویست بۆڕیە نەوتیە وەستاوەکەی نێوانیان بەگەڕ بخاتەوە. فشارێکی تازە بۆ سەر ئیسرائیل دروست بکات. زەمینەیەکی هاوبەش لەگەڵ عێراق بۆ پشتگرتنی ئەو ڕاپەڕین و خۆپیشاندانەی ئێران خۆش بکات کە تازە خەریکی تەقینەوە بوون. بێجگە لەمانە، لەو کاتەدا سەرۆکی میسر ئەنوەر ئەلسادات چوو بووە ئیسرائیل، ئەمەش لەنگەری نێوان ئیسرائیل و سوریای هەتا ڕادەیەکی زۆر تێک دابوو. بۆیە ئەلئەسەد دەیویست بەم خۆشکردنەی پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ بەغدا لەنگەرەکە هەتا ڕادەیەک لە پێناو بەرژەوەندیەکانی خۆی ڕاست بکاتەوە.

عـێـراقـیش لەو بەرامـبـەرەدا چاوی لە هەڵکشـانی دەسـەڵات بـوو بۆ ناو سـوریا. پێی وابوو ئەو پەیوەندییـە تازەیەی نێـوان قـاهیـرە و تەل ئەبیب ڕەنگە ڕێگەی لەبەردەم خۆش بکات بۆ ڕاکێـشـانی جڵـەوی نەتەوەیی لە دەست سـوریا. بێـجگە لەمـە ترسـێکیـشی لە دڵ دروست ببوو بەرامـبـەر بەڕووداوەکانی ئێران. بۆیە پێی وابوو وا چاکترە سوریا لەم نێوانەدا هێـمن بکاتەوە، نەوەکا زۆرتر دەست تێکەڵاوی ڕووداوەکانی ناو ئێران بکات.

بەڵام وەک سالانی پێشتر ئەم هەوڵەش زۆر نەژیا. هۆی زۆر نەژیانەکەش ئەوە بوو بەغدا و دیمەشق نەپێش ئەو هەوڵ و تەقەللایانەی ئاشتبوونەوە و نە لە سـەردەمی هەوڵەکـانیـشـان، هیـچ جۆرە هاوکـارییـەکی ئابوورییـان لە نێوان خۆیاندا دروست نەکرد تا ئەم هاوکاریە زامنی ڕێگەگرتن بێت لە هەر ناکۆکیەکی تازە.

هەروەها هەوڵـیـشـیـان نەدا ڕۆشنبـیـرییـەکی تازەی لەیەکـدی بوردن و کـرانەوە بەسـەر یەکـدیدا بێننە کـایەوە. بگرە بەهەمـان عـەقڵ و زمـان و فـەرهەنـگی جـاران مـانەوە، ئەگـەرچی پێشـتـر بۆریە نەوتە هاوبەشـەکەی نێوانیشیان ڕێگەی نەگرتبوو لە تەقینەوەی ناکۆکیەکانیان.

لەو سـەردەمـانەدا، جـیـاوازی لە هەڵـوێسـتـی دەوڵەتی هەر دوو وڵاتدا دەورێکی گرنگی هەبوو لە پەرەسەندنی ناکۆکیـەکانیان. سوریا بەهۆی شەڕ و ناکـۆکـیی لەگـەڵ ئیـسـرائیل پشـتـی دابووە یەکـیـەتی شـۆرەوی و هاوپەیمانیـەتێکی توندی لەگەڵ مۆسکۆ بەسـتبوو. لەولاوە عێـراق بەهۆی لاوازیی هەڵوێستـەکانی بەرامبـەر بەکورد و ئێران ناچاری پشت بەستن بوو بەئەمەریکا.

بێـجگە لە فـاکـتـەری دەولی، فـاکـتـەری ناوچەییش دەوری زۆر بوو لە شێـواندنی نێوانیـان. لێرەدا شەڕی ناوخۆی لوبنان لە ١٩٧٥ و هەڵـکشـانی لەشکری سوریا بۆ ناو ئەو وڵاتە لە ١٩٧٦دا کێشـەیەکی گەورەی ناکۆکی بوو لە نێـوان دیمەشق و بەغـدا، بەتایبـەتی بەغـدا وای لێکدەدایەوە کـە بڵاوبوونەوەی لەشکری سوریا لـە لوبناندا یەک لە مەبەستەکانی لەناوبردنی

دەسەڵاتی عێراق و حزبی بەعسی سەر بەعێراق و چەند ڕێکخراوێکی فەلەستینی سەر بەعێراقە.

ئینجا کێشەیەکی دیکە کە چەند ساڵێک بوو دروست ببوو لە نێوانیان مەسەلەی ئاو بوو. ڕاستە هەر دوو دەوڵەتەکە بەیەکەوە هاوبەشیەکیان هەبوو لە ڕووبەڕووبوونەوەی پرۆژەکانی تورکیا بۆ دروستکردنی چەند بەربەستێکی ستراتیژیی ئاو لە کوردستانی تورکیادا، بەڵام ئەم هاوبەشیە ڕێگری ئەوە نەبوو هەردوو دەوڵەتەکە ناکۆک بوون لەسەر ئەو بەربەستەی سوریا دروستی کردبوو لەسەر زێی فوڕات لە ناوچەی ئەلرەقە. ئینجا پێوانەی ئەو ئاوەی سوریا دەیدا بەعێراق جێگەی مشتومڕێکی زۆر بوو لە نێوانیاندا.

لەم کاتەدا گۆڕانکاریەکی گەورەی حزبی لە عێراقدا ڕووی دا، کاتێک سەرۆکی پێشوو (ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر) لادرا و سەرۆکی ئێستا سەدام حوسێن هاتە شوێنی. ئەم گۆڕانکاریە زۆرتر ناکۆکیەکانی بەرە و توندوتیژی برد تا وای لێهات پاش هاتنە سەر کاری سەرۆکی ئێستای عێراق لە ۱۹۷۹دا، قەسابخانەیەکی تازە لە بەغدا بۆ چەندین سەرکردەی بەعسی دانرا بەتۆمەتی ئەوەی پەیوەندییەکی نهێنیان لەگەڵ سوریا بەستووە بۆ کودەتایەکی لەپڕ، هەر لەو کاتەدا چەندین کادیر و ئەندامی بەعسی کە سەر بەدیمەشق بوون کوژران و گیران و بێ سەر و شوێن کران. پێشتریش سوریا لە ساڵی ۱۹۷۵دا چەند کەسێکی لە سێدارەدا بەتۆمەتی ئەوەی سەر بەعێراقن و ویستوویانە بەفیتی بەغدا دەست بەسەر ئوتێلێکی گەورە لە دیمەشق بگرن و خەڵکی مەدەنی بەبارمتە بگرن.

دیمەشق گۆڕانکاریەکەی سەرکردایەتیی بەعسی عێراقی بەهەند هەڵنەگرت، چونکە دیار بوو ئێران خەریک بوو هاوپەیمانێکی تازەی بۆ دروست دەبوو. ئەم هاوپەیمانێتیە زامنی ئەوە بوو (بەڕای سوریەکان) فشارێکی تازە بۆ سەر بەعسیەکانی عێراق دروست بکات. هەروەها دوای سەردانی سەرۆکی میسر ئەنوەر ئەلسادات بۆ تەل ئەبیب تەواوی هیوای

عـەرەب ڕووی لە سـوریا کـردبوو، بەتایبـەتی کـە عـەرەب هەنگاوەکـەی ساداتیان بەحەکیمانە لە قەڵەم نەدا.

## کورد لە نێوان عێراق و سوریادا

هەر کـاتێک باس لە پەیوەندیە هاوچەرخەکانی نێـوان سـوریا و عـێـراق بکرێ، دەبێت ئاوڕێکی بەڕاسـتی لە جـێگەی کـێـشـەی کـورد لەناو ئەو پەیوەندیانەدا بدرێتەوە.

ئەوی ڕاستی بێت هەر لە نیوەی دووەمی پەنجاکانی سەدەی ڕابردووەوە، کەم تا زۆر، لێپرسراوەکانی سوریا جۆرە ئاشنایەتییەکیان لەگەڵ مەسەلەی کورد پەیدا کرد. ئەوسا میـسری هاوپەیمان لەگەڵ نەتەوەخوازەکانی سوریا بەتەنگ ئەوەوە بوون دۆستایەتیی کورد بکەن بۆ جووڵاندتیان لە دژی ئێران و تورکیا.

هەروەها مۆسکۆیش هانی ئەو جۆرە دۆستـایـەتیەی دەدا. بۆیە سـوریەکـان لە ڕێگـەی هەندێ لە دیموکـرات و نەتەوەییـیـەکـانی عـێـراقی وەک سـدیق شنشل و فائق ئەلسامرائی جۆرە پەیوەندیەکیان لەگەڵ کورد پەیدا کـردبوو. هەروەها بەم بۆنەیەوە ڕێگـەی نوێنەرانی کـوردیان دەدا لـە دیمەشـقـەوە بەرەو مـۆسکۆ و چین بـچن. هەروەها ئەکـرەم حـۆرانی و عـەبدولحـەمـید سـەراج پێشوازییان لەو نوێنەرانە دەکرد.

بێگومان، ئەم وێنەیە ئەوە ناگەیەنێ کە سوریەکان لەگەڵ چارەسەرکردنی کـێـشـەی کـورد بوون بەشـێـوەیەکی سـیـاسی، یان هانی چارەسـەرێکی ئاشـتـیـانەی ئەو کـێـشـەیەیان دەدا، بەڵکو زۆرتر دەیانەویست لە دژی پادشایەتییەکەی عێراق بەکاری بهێنن.

دواتر ئەم بارودۆخـە زوو گـۆڕا، کـاتێـک لە هەردوو وڵاتدا بەعس هاتە سەر حوکم. ئەوە بوو سوریەکان لیوایەکی سەربازیان نارده هانای حکومەتی عێراق بۆ شەڕی کورد لەو ساڵەدا. ئینجا کە حکوومەتی بەعس لە عێراق ڕووخا لەسەر دەستی عەبدولسەلام عارف، سوریا تەواوی پەیوەندییەکانی

خۆی لەگەڵ کورد بڕی.

پێ ناچێ لە دوای گۆڕانکاریە گەورەکەی ناو بەعسی سوریا لە ١٩٦٦ تا ١٩٦٨ هیچ گۆڕانکاریەکی ئەوتۆ لە هەڵوێستی بەعسیە چەپڕەوەکانی دیمەشق ڕووی دابێت بەرامبەر بەکێشەی کورد لە عێراق. ئەوەی زۆرتریش ئەو هەڵوێستە ناجۆرەی سوریەکانی قووڵتر کردبوو بەرامبەر بەکوردی عێراق، هەڵوێستە توندڕەوەکەیان بوو بەرامبەر بەکێشەی کورد لەناو سوریا خۆیدا. ئەوسا بەعسیەکانی سوریا سیاسەتی پشتێنی بەعەرەبکردنی ناوچە کوردیەکانی سوریایان گرتبووە پێش، بەتایبەتی کە ئەم ناوچانە لە ڕووی ئابووری و نەوتیەوە دەوڵەمەند بوون.

پاش کودەتاکەی (حافظ ئەلئەسەد) لە ١٩٧٠ مەسەلەکە هەتا ئەندازەیەک گۆڕانی تێکەوت. ئیتر سوریا لەو کاتەوە بەچاوێکی گونجاوتر سەیری کێشەی کوردی عێراقی دەکرد و، زۆرتر بایەخی بەپەیوەندی بەستن لەگەڵ ئەو کێشەیە دەدا، ئەگەرچی هەڵوێستی بەرامبەر بەکوردەکانی ناو سوریا گۆڕانکاریەکی ئەوتۆی بەسەر نەهاتبوو.

هۆیەکانی ئەم هەڵوێستە تازەیەی دیمەشق ڕەنگە بەلای یەکەمەوە پەرەسەندنی ناکۆکیەکانی دیمەشق و بەغدا بووبێت. هەروەها ئەو فشارە بووبێت کە بەغدا بۆ سەر دیمەشقی دروست کردبوو بەتایبەتی لە سەرەتای حەفتاکاندا، بەڵام لە لایەکی دیکەوە هەستێکی ئەوەیشی تێدابوو کە بنەماڵە فەرمانڕەواکەی دیمەشق عەلەوین و کەمینەیەکی بچووک پێک دێنن لە سوریا، نزیکەی ٦ لە سەدا. ئەم حاڵە وای کردووە هەمیشە هەستێکی گەرمیان هەبێت بەرامبەر بەکێشەی کەمینەکانی دیکە و حەز بەیارمەتیدانیان بکەن و هەتا ڕادەیەک لە بەرامبەر زۆرینەدا پشتیشیان پێ ببەستن.

بەهەر حاڵ سوریەکان دوای دروستکردنی ئەو پەیوەندیە لەگەڵ کورد، دیاربوو نەیاندەویست پەیوەندییەکە تووشی سەر ئێشە و ناخۆشی و دەستا و دەست بکەن. بۆیە ئامادەنەبوون هەتا لەو کاتانەی کە نێوانیان خۆش

دەبوو لەگەڵ بەغدا دەست لە پەیوەندی لەگەڵ کورد هەڵبگرن. ڕەنگە ئەمە لە لایەکی دیکەوە سەرچاوەی لەوە هەڵگرتبێ کە بەعسیە سوریەکان باوەڕ و متمانەیەکی زۆریان بەهاوڕێکانی بەغدایان نەبووە و نەیانویستووە زوو دەست لە کورد هەڵبگرن.

ئەوەی ڕاستی بێت وا نەبێ دیمەشق ئەم هەڵوێستەی تەنیا لەبەرامبەر بەغدا هەبووبێت. بەڵکو لە کاتێکدا کە لەگەڵ ئێرانیش نێوانی زۆر ناخۆش بوو لە (١٩٧٣ و١٩٧٤ و١٩٧٥) گلەییەکی ئەوتۆی لە کورد نەبوو، کە بۆ هاوپەیمانێتیی لەگەڵ تاران بەستووە. بەپێچەوانەوە ئەویش لە باری خۆیەوە ڕێگەیەکی باشی لەبەردەم کورد و شۆڕشی کورد کردبۆوە.

ئینجا ئەوەی قابیلی سەرنجە ئەوەیە کە دیمەشق ڕاستە وەک ئێران زۆرتر لە ڕێگەی دەزگا ئیستیخباراتییەکانی پەیوەندیی لەگەڵ کورد بەستووە، بەڵام لە هەمان کاتدا دیمەشق ڕەنگە زۆرتر لە وڵاتانی دیکە پەیوەندییەکی سیاسیشی لەگەڵ کورد هەبووە. هەر زوو ڕێگەی داوە پارتی و ئینجا دواتر یەکێتی نوێنەرایەتیی سیاسیان هەبێ لە دیمەشق و لە چەندین بۆنە و یاد و ڕووداودا لێپرسراوە سیاسیەکانیان پێشوازییان لە لێپرسراوە سیاسییەکانی کورد کردووە. لەم بوارە ڕەنگە ئەو پێشوازیەی سەرۆکی پێشووی سوریا (حافظ ئەلئەسەد) لە سەرۆک مسعود بارزانی کرد ساڵی ١٩٩٩ یەک لە ئێستگە هەرە گەشەکانی مێژووی پەیوەندیی نێوان کورد و سوریا بێت.

ئینجا شایەنی گوتنە لەم نێوانەدا کە سوریا لە دوا ساڵانی فەرمانڕەوایەتی (حافظ ئەلئەسەد)دا هەتا ئەندازەیەک کەوتە ڕەفتارێکی نیمچە تازەوە لەگەڵ کوردی ناوەخۆی. هەر نەبێت لەم بوارەدا دەکرێ هێما بۆ ڕاگرتنی سیاسەتی پشتێنی عەرەبی بکرێت.

دەگوترێ نیمچە تازە، چونکە هەندێک لە لێکۆڵەرەوان پێیان وایە ئەم هەڵوێستەی ئەلئەسەد بەرامبەر بەکورد زۆرتر پابەند بووە بەناکۆکیەکانی نێوان سوریا و تورکیا نەک هەڵوێستێکی تازە لە بواری تێگەیشتنی کێشەی کورد و هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی.

ئەم هەڵوێستە گونجاوەی دیمەشق بەرامبەر بەکورد هەمیشە جێگەی نارەزایی حکوومەتی بەغدا بووە. بگرە هەمیشە یەک لە دەمارەکانی ناکۆکی و ناخۆشی بووە لە نێوان هەر دوو وڵاتدا.

رەنگە لەم نێوانەدا کوردی عێراق جۆرە زیانێکی پێگەیشتبێت، بەڵام گومان لەوەدا نییە کە قازانجی کورد لە پەیوەندیەکانی لەگەڵ دیمەشق بەدرێژایی بیست و پێنج ساڵی ڕابردوو، زۆر لە زیانەکان گەورەتر بووە. هەروەها زۆرتریش گەورەتر بووە لەو قازانجانەی کورد لە وڵاتەکانی دیکەی دەوروپشتی کردووە، ئەگەر باس باسی قازانج بێت لەم بوارەدا.

## سزا و هەڕەشەی سزا

کاتێک عێراق شوباتی ١٩٩١ لە کوێت دەرکرا، سوریا ئەندامی ئەو هاوپەیمانێتیە دەوڵەتیە بوو کە سوپای عێراقی لەو دەوڵەتە نەوتیەی کەنداو دەرکرد. هەروەها دواتر دیمەشق هیچ گیروگرفتێکی نەبوو بۆ ڕاگەیاندنی پابەندیی خۆی بەبڕیارەکانی ئەنجومەنی ئاسایش لە بارەی عێراقەوە. بگرە هەندێک لە پسپۆرانی بواری کێشەی سوریا و ئیسرائیل وای بۆ دەچن کە دیمەشق هیوای ئەوەبوو بڕیاری داماڵینی عێراق لە چەکی کۆمەڵکوژ بەوە تەواو بێت کە ئیسرائیلیش لەو جۆرە چەکە داماڵێنرێ.

بەڵام دیاربوو ئەم هەڵوێستەی سوریا تا سەر وەکو خۆی بەردەوام نەبوو، چونکە چەندین ڕووداوی تازە لە ناوچەکە و جیهاندا ڕوویان دا لەو نێوانەدا. لەلایەکەوە بلۆکی دەوڵەتانی سۆسیالیزم و یەکێتی شۆرەوی ڕووخان کە سەرچاوەیەکی گرنگی چەک و تەقەمەنی بوو بۆ سوریا. لەلایەکی دیکەوە ئەمەریکا هەر زوو ئەنجامەکانی شەڕی کەنداوی بۆ ئەوە بەکارهێنا کە دەوڵەتانی عەرەب و ئیسرائیل بەیەکەوە کۆ بکاتەوە لە مەدرید ساڵی ١٩٩٢. ڕاستە سوریا ئامادەی کۆبوونەوەکانی مەدرید بوو، بەڵام لە دڵەوە نەیدەویست، هەروەها بەخۆڕایی و بێ هیچ قازانجێکی پێشەکی لەگەڵ ئیسرائیل لەسەر یەک مێز دابنیشن، دواتر کارەکە ئاڵۆزتر بوو کاتێک ئیسرائیل و فەلەستینیەکان لە ١٩٩٣ بەدزیەوە لە ئۆسلۆ

کەوتنە گفتوگۆ و ڕێککەوتننامەی (ئۆسلۆ١)یان ڕاگەیاند.

لە سەرێکی دیکەوە دیار بوو کێشە و گیروگرفتەکانی تورکیا و سوریا زۆر تاویان سەند. تا وای لێهات خەریک بوو دوای چەند ساڵێک تووشی ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازیی بن. لەو ماوەیەدا عەبدوڵڵا ئۆجەلانی سەرۆکی (پەکەکە) لە سوریا دەژیا.

هەر پابەند بەم هەڵوێستانەی سەرەوە، زۆری نەبرد ئیسرائیل و تورکیا هاوپەیمانێتیەکی سەربازییان لە نێوان خۆیاندا دروست کرد کە جێگەی مەترسییەکی زۆر بوو بۆ دیمەشق. ئەمەریکا هانی ئەم هاوپەیمانێتیەی دا و لەلایەکی دیکەش هەوڵی دەدا زۆرترینی فشار و توانستەکانی جیهان و نەتەوە یەکگرتووەکان و دەوڵەتانی ئەوروپا بۆ ئەوە ئاراستە بکرێت کە لە پلەی یەکەم دا کێشەی نێوان فەلەستینیەکان و ئیسرائیل چارەسەر بکرێت.

ئەمانە تێکڕایان فشارێکی زۆریان بۆ سەر سوریا دروست کردبوو. ئینجا فشارەکە لایەنی ئابووریشی گرتەوە کاتێک بەدەستخۆشی لێکردنی ئەمەریکا، ئوردن و تورکیا کەوتنە گەشەپێدانی پەیوەندییە ئابوورییەکانیان لەگەڵ عێراق لە چوارچێوەی سزا دەوڵەتیەکاندا.

سوریا پێی وابوو ئەم هاوکارییە دوو لایەنیش هەر مەبەستی گەمارۆدانی ئەوە.

بۆیە دیمەشق هەوڵێکی بێ ئەندازەی لەگەڵ سعودیە و کوێت دا کە نارەزایی دەرنەبڕن لە هەر جۆرە پەیوەندیەکی ئابووری لەگەڵ عێراق ببەستی بەو مەرجەی ئەم هاوکاریە لەناو چوارچێوەی بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بێت و، هیچ ناواخنێکی سیاسیی نەبێت غەیری ناواخنی ئەوەی کە کارتێک لە دەست دیمەشق دروست بکات لە ڕووی ئیسرائیل. سعودیە و کوێتیەکان گلەییەکی ئەوتۆیان لەم جۆرە هاوکاریە نەبوو، چونکە ئەوانیش تا ڕادەیەک پەیوەندیەکی ساردیان لەگەڵ عەممان هەبوو، هەروەها زۆر پەیوەندییان لەگەڵ ئەنقەرە گەرم نەبوو.

ئەوە بوو سوریا کەوتە پەیوەندی لەگەڵ عێراق و، زۆری نەبرد سەرۆکی وەزیران سەردانی بەغدای کرد و چەندین ڕێککەوتننامەی بازرگانی و ئابوورییان ئیمزا کرد. بگرە باس هاتە سەر باسی ئەوەی کە سوریا و عێراق لەسەر ئەوە پێک هاتوون بۆڕیە نەوتیەکەی نێوانیان بخەنەوە گەڕ.

ئەم هەڵوێستەی سوریا فشارێکی زۆری خستە سەر ئەمەریکا، بەتایبەتی کە سوریەکان توانیبوویان کێشەی خۆیان لەگەڵ ئەنقەرە چارەسەر بکەن و، نێوانیان لەگەڵ ئیسرائیلیش تا دەهات ناخۆشتر و ئاڵۆزتر دەبوو. هەروەها ئەمەریکییەکان لەگەڵ تاوسەندنی ئابوورییەکانی عێراق و سوریا لە دوای وەفات کردنی (حافظ ئەلئەسەد) کەوتنە باسی ئەوەی کە سزا دەوڵەتییەکان لەبەردەم مەترسیی هەڵوەشانەوە دایە. ئەوەبوو دوای دامەزراندنی ئیدارەی تازە لە واشنتۆن، هەر زوو وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا (کۆڵن پاوڵ) هاتە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و سەردانی دیمەشقی کرد و لە بارەی سیستەمێکی تازەی سزاوە لە دژی عێراق لەگەڵ سوریەکان قسەی کرد، بەڵام سوریەکان دیاربوو هەڵوێست گەرمییەکی ئەوتۆیان نەنواند بەرامبەر بەسزا تازەکان، بگرە هیچ پەیمانێکیشیان بەکۆڵن پاوڵ نەدا کە پەیوەندیە ئابوورییەکانیان لەگەڵ بەغدا ڕابگرن، غەیری پەیمانی ئەوە نەبێت کە ڕێگە نەدەن بۆڕیە نەوتەکەی نێوان سوریا و عێراق بکەوێتەوە ئیش.

عێراق لەم بەرامبەرەدا چاوی لە دیمەشق بڕیبوو. دەیویست لە ڕێگەی هاوکاریی ئابووری لەگەڵ دیمەشق درزێکی زۆر گەورە بخاتە ناو دیواری سزاکانەوە. هەروەها درزێکی گەورەتریش بخاتە نێوان ئەو پەیوەندیە گەرم و توندانەی لە نێوان سوریا لە لایەک و سعودیە و کوێت لە لایەکی دیکە هەیە. هەروەها دەیویست پشتبەستنی خۆی بەڕێگەی ئوردن کەم بکاتەوە و ئەگەر بکرێ لە نێوان ناکۆکیەکانی دیمەشق و عەممان یاری بکات.

بۆ ئەم مەبەستە عێراق لە ماوەی یەک دوو ساڵی ڕابردوودا هەوڵێکی زۆری لەگەڵ سوریا دا. بگرە بەم دواییییە یەک لە لێپرسراوە گەورەکانی

عێراق بەئاشکرا ڕای گەیاند کە عێراق ئامادەیە نەک هەر بۆ هاوکاریی ئابووری لەگەڵ سوریا، بگرە بۆ هاوکاریی سەربازی و سیاسی و حزبیش.

بەڵام دیاربوو وەک چۆن ناکۆکی و بێ متمانەیی لە نێوان بەغدا و دیمەشق ببووە کەلتوور و نەریت، هەر نێوانەکە پڕ دەماری ناکۆکی مایەوە ئەگەر چی سوریەکان و عێراقیەکان بەرژەوەندییان لەوەدایە ناوە ناوە تەئکید لەسەر بایەخی پەیوەندییەکان بکەن و، ناوە ناوە شاندی ئابووری بگۆڕنەوە. ڕەنگە یەک لەو فاکتەرانەی دەستی دیمەشق لە گەشەپێدانی پەیوەندییەکانی لەگەڵ عێراق سارد دەکاتەوە، نەک هەر کوێت و سعودییە، بگرە فاکتەری تریش لە ئەمەریکا دەورێکی گرنگی هەیە، بەتایبەتی کە سوریا خۆیشی وەک عێراق و ئێران ناوی لەناو لیستی دەوڵەتانی پشتگری تیرۆرە و، دوور نییە لە هەر لادانێکی دیمەشق لە هێڵی سووری عێراق، ئەو مەسەلەی لە ڕوو ڕاست بکاتەوە و، هەڕەشەی سزا لەویش بکات.

بەهەر حاڵ، ڕەنگە سوریا و عێراق نزیک بکەونەوە. ڕەنگە هاوکارییەکی ئابووری و بگرە سیاسیش بکەوێتە نێوانیان، بەڵام ئەوەی ڕاستە و گومانی تێدا نییە کە بەعس هەر بەدوو بەعسی دەمێنێتەوە و هەرگیز نابێت بەیەک.

## عێراق و کەنداو
## بوونی نەوت و ئاگری دەسەڵات

یەک لە گیروگرفتە هەرە گەورەکانی عێراق، پەیوەندییە دەرەکییەکانێتی لەگەڵ دەوڵەتانی کەنداو، بەتایبەتی لەگەڵ سعودیە و کوێت. ئەگەرچی پۆپەی ئەو گیروگرفتە لە ٢ی ئابی ١٩٩٠ دەرکەوت، کاتێک نزیکەی ٧٥٠ هەزار سەرباز و ئەفسەری عێراق بۆ ناو خاکی کوێت هەڵکشان و لە ماوەی ڕۆژێکدا خەریک بوو ئەم دەوڵەتە لە نەخشەی ناوچەکە بسڕنەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گیروگرفتەکان مێژوویەکی درێژتریان هەیە، هەروەها چەندین هۆی دیکەیان هەیە غەیری ئەو هۆیە ئابووری و نەوتییەی کە زۆرتر لە ماوەی دە ساڵی ڕابردوودا باسی لێوە کراوە. لە لایەکی دیکەوە ئەم گیروگرفتە خوێناویەی نێوان کەنداو و عێراق لە هەموو گیروگرفتە ناوخۆیی و ناوچەیی و جیهانییەکانی دیکەی عێراق کاریان لە تەواوی ڕەوشی دەوڵەتی عێراق کردووە و، تووشی سزا نێودەوڵەتیەکان هاتووە و هەڕەشەی دادگاییکردنی دەوڵەتی لە لێپرسراوە گەورەکانی دەکرێ. ئابووری عێراق بەتەواوی پەرپووت بووە و هەلومەرجە سیاسییەکەی تووشی گۆشەگیرییەکی زۆر هاتووە. چەپۆکە سەربازی و داپڵۆسێنەرەکەی ڕژێمی فەرمانڕەوا تا ڕادەیەک زۆر سست و بێ توانا بووە و، بگرە لە هەندێ برگەیدا تووشی هەڵوەشانیش هاتووە. ڕاستە ئەم هەلومەرجەی عێراقی تێکەوتووە لە ئەنجامی پەیوەندییە شڵۆقەکەی نێوان عێراق و دەوڵەتانی کەنداو لە ئەنجامی هەڵەیەکی گەورەی سەرکردایەتیەکەی ئێستای عێراق هاتووە، بەڵام لە هەمان کاتدا ڕاستیشە کە ئەم هەڵەیە زادەی پرۆسەیەکی مێژوویی هەڵەیەکی گەورەترە کە سیستەمی دەوڵەتی عێراقی لەسەر دامەزراوە. بگرە لە هەندێ هەڵەی زۆر کۆنتریش سەرچاوەی هەڵگرتووە و ڕەگوڕیشەکانی دەگەڕێتەوە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمی سەدەی ڕابردوو وەک دواتر باسی دەکەین.

بەهەر حاڵ، تاوەکو کۆتایی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو زۆربەی چاودێرە نەتەوەییــیــە عـەرەبەکـان وایان لێکدەدایەوە، کـە گـورزی کـوشندە لە دژی عێراق، ڕەنگە دەوڵەتانی بێگانە لە باکوورەوە، واتە لە کـوردسـتـانەوە لێی بدەن. بەڵام لە یەکەم ساڵی نەوەدەکانی هەمان سەدەدا لە پڕ دەرکەوت کە ئەو گـورزە لەدەوڵەتانی بێگانەوە نـایەت، بەڵکو لە خـودی ڕژێمی عـێـراق خـۆیەوە. هەروەها لـە باکـووریشـەوە نـایە، بـەڵکـو لە باشـوورەوە. ئەم وەرچەرخانەی مەترسییە ستراتیژییەکانی سەر عێراق، نەک هەر چاودێرانی سـیـاسـیی سـەرسـام کـرد، بگرە عـێـراق خۆی و دەوڵەتانی دەوروپشـتی و جیـهـانی عـەرەب و دەوڵەتانی گەورەشی سـەرسـام کـرد، دیار بوو دەوڵەتی عێراق هەر لە سەرەتاوە لەسەر بنەمایەکی ناڕاست و دروست دامەزرابوو، بۆیە نەک هەر لە پەیوەندییەکانی ناوەوەیدا کلۆریی تێکەوتبـوو، بەڵکو لە پەیوەندییەکانی دەرەوەیشیدا خەریک بوو ئەم کلۆریانە دەردەکەوتن.

عێراق و سعودیە و کوێت سێ دەوڵەتی بەرهەمهێنەری نەوتن. لە ڕووی جوگرافیەوە کەوتوونەتە هەڵکەوتەیەکی گەلێک ستراتیژی و پڕ بایەخی جیـهـان کـە کـەنداوە، چۆنیـەتی پەیوەندییـەکـانی نێـوان ئەم سێ دەوڵەتە توانای ئەوەی هەیە ڕووگـەی زۆربەی ڕووداوەکـانی سـیـاسـەت لە تەواوی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەستنیشان بکات.

هەر کاتێک ئەم سێ دەوڵەتە تەبا بووبن توانیویانە تەنگ بەدەوڵەتێکی گـرنگی وەک ئێـران بچنن. هەروەها هەر کـاتێکیش ناتەبا بووبن، چارەنووسی ناوچەکە و جیـهـانی عـەرەبیـان گـەیاندۆتە ڕۆژگـارێکی وەکـو ئەمڕۆ. ئینجا ئەوەی جێگەی سەرنجە کە ئەم سێ دەوڵەتە، نەک هەر لەم دە ساڵەی دوایی، بەڵکو بەدرێژایی نەوەد ساڵی ڕابردوو هەمیـشـە ناتەبا و نارێک و نێوانیان پڕ گرێ و گیروگرفت بووە.

لەم نووسـینە کـورتەدا هەوڵ دەدرێ لە دیمەنێکی گـشـتـیـیـەوە سـەیری پەیوەندییـەکـانی ئەو سێ دەوڵەتە بکرێت. هەروەها لەو ڕوانگەیەشـەوە پەنجـە بۆ ئەو لایەنانە درێژ بکرێ، کـە کـاریان لە ڕەوتی بزووتنەوەی

دیموکـراسی و نەتەوەیی گـەلی کـورد کـردووە، بەوپێـیـەی کـە ڕوودوادە ناوچەییـیەکانی نێوان ئەو سێ دەوڵەتانە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ کاریان لە ڕەوتی سیاسیی کوردستان و گەلی کورد کردووە.

## گەڕانەوەیەکی بەپەلە بۆ مێژوو

حیجاز بەدرێژایی بیست ساڵی پێش هەڵگیرسانی جەنگی جیـهانیی ناوەندێکی بەرچاوی بزووتنەوەی نەتەوەیی عـەرەبی بوو. بەڵام ئەم ناوەندە بەپێـچەوانەی ئەوەی لە مـیسر و سوریا ڕووی دەدا، زۆرتر لە پەیوەندییـە تیرەگەرییەکانی ئەو ناوچەیەوە سەری هەڵدەدا.

حیجاز و نەجد، زۆری نەبرد بووە گۆڕەپانی شەڕێکی تیرەگەری لە نێوان چەندین بنەمـاڵەدا. ئاڵ سـعـود و ئاڵ هاشم و ئاڵ ڕەشـیـد و ئاڵ سـەباح لە بنەمـاڵە سـەرەکـیەکانی مەیدانی ئەو شەڕە خێـڵەکـیـە بوون. لە ڕاستـیدا دەکرا ئەم شەڕانە ڕوو نەدەن ئەگەر بەریتـانییـەکان ئەو پەیمانانەی بۆ مـیری حیجاز «شەریف حسێن»یان بڕیبوو جێبەجێیان بکردایە. بەڵام کاتێک شەڕ تەواو بوو لە جیـاتی جێـبـەجێکردنی پەیمانی دروسـتکردنی دەوڵەتێکی عـەرەبی یەکگرتوو لە ژێر پادشـایەتیی شەریف حسـێن دا، چەند وڵاتێکی عـەرەبی بۆ کـوڕەکـانی دامـەزرێنرا. کـەچی حـیـجـاز و دورگـەی عـەرەبی هێـڵـرایەوە بـۆ کـۆمـەڵێک شـەڕ و ناکـۆکـیی خـێـڵایەتی لە نێـوان بنەمـاڵە گەورەکانی ئەو ناوچەیەدا.

لە ڕاستیدا مەزەب و ئایین لەو نێوانەدا دەورێکی گرنگی هەبوو، چونکە یەک لە خێـڵـە گەورەکـانی ئەو ناوچەیە (ئاڵ سـعـود - عـەبدولعـەزیز ئیبن عـەبدولڕەحمـان ئەلسـعـود) وەهابی بوون (واتە پەیڕەوانی مـحـەمـەد ئیبن عـەبدولوەهاب) خـۆیان بەشـایەسـتـەتر دەزانی. واتە سـوننەیەکی توندو ئەرسەدۆکسی. کەچی لەو نێوانەدا چەندین خێـڵی غەیرە وەهابی هەبوو کە جۆرە هاوکاریەکیان دروست کرد لە نێوان خۆیاندا لە دژی ئاڵ سعود. باشتر دیار بوو ئەم خێـڵەی دوایی توانی ئەوانی تر پەرتەوازە بکات و دەسەڵاتی بەسەر میری حیجازیشدا زاڵ بێت و میرنشینێکی سەربەخۆ لە حیجاز و

نەجد دروست بکات. لەولاوە کوڕەکانی میری حیجاز بەسەر عێراق و ئوردن دابەش بوون و، لەو دوو وڵاتەدا پادشایەتییان بۆ دامەزرێنرا بەهاوکاریی ئینگلیز.

یەکەم گیروگرفت لە نێوان سعودیە و عێراق کە دەستی پێکرد پەیوەندیی بەدابەشکردنی سنوورەوە هەبوو، چونکە هەر دوو وڵاتەکە خاوەنی سنوورێکی مێژوویی نەبوون کە بتوانرێ لەسەر ئەساسی ئەو مێژووە سنوورە تازەکەی نێوانیان دابڕێژرێتەوە. ئینجا هەر لەگەڵ ئەو کێشەیە پێکدادانەکانی نێوان خێڵە وەهابیەکان و خێڵە شیعەکانی عێراق دەستی پێکرد. ئەم پێکدادانانە ئەگەرچی زۆرتر خێڵەکی بوون، بەڵام لە ڕاستیدا دەمارێکی سیاسیشیان هەبوو کە ئەویش پەیوەندی بەناکۆکییەکانی نێوان بنەماڵەی فەیسەڵی یەکەم و سعودییەکان هەبوو، دواتر ئەم پێکدادانانە گەیشتنە ئەوەی خێڵەکانی سعودی هێرشیان دەکردە سەر هەندێ دەوروبەری نەجەفیش کە بەمەڵبەندی شیعە دەژمێردرێ.

لەولای دیکەوە کوێت هێشتا میرنشینێکی بچووک و بێ دەسەڵات بوو. چ گیروگرفتێکی ئەوتۆی لەگەڵ بەغدا بۆ دروست نەبوو بوو، ئەگەرچی یەکەم گیروگرفت لەو نێوانەدا ساڵی ١٨٧٠سەری هەڵدا کاتێک والیی بەسرا بەیاننامەیەکی دەرکرد و تیایدا بەئاشکرا ئەوەی ڕاگەیاند کە کوێت سنجەقێکی سەر بەویلایەتی بەسرەیە.

ئەو کاتە ئینگلیز تازە دەسەڵاتی خۆی لە ناوچەی کەنداودا بڵاو دەکردەوە، بۆیە توانی بەئاسانی ڕێگە لە تاوسەندنی ئەو گیروگرفتە بگرێت.

لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانیی ئینگلیز بەتەواوی دەسەڵاتی خۆیان لە ناوچەکەدا قایم کرد. زۆری نەبرد پەیوەندییەکی گەرمیان لەگەڵ تیرەکانی دوورگەی عەرەبی دروستکرد. پێشتریش پەیوەندییان زۆر خۆش بوو لەگەڵ میری حیجاز. لەولاوە ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی و دامەزرانی چەند دەوڵەت و میرنشینێکی جیا، کۆمەڵێک گیروگرفتی

تازەی هێنایەوە گۆڕێ لەو ناوچەیەدا.

دوای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی ڕابردوودا پەیوەندییەکی ناخۆش بەهۆی سنوورەوە لە نێوان عێراق و سعودیە و کوێت دروست بوو. ئینگلیز بۆ چارەسەرکردنی ئەو حاڵەتە هەر سێ لای قەناعەت پێکرد لە ساڵی ۱۹۲۲دا ڕێککەوتننامەی (العقیر) مۆر بکەن کە بەیەکەم ڕێککەوتننامەی وێنەکێشانی سنوور دەژمێردرێ لە نێوان هەر سێ وڵاتدا.

ئینجا کە نەوت لە عێراق و کەنداودا دۆزرایەوە گیروگرفتێکی زۆرتر سەری هەڵدایەوە، داواکاریەکانی مەلیک غازی لە ساڵی ۱۹۳۳تا۱۹۳۹ بۆ ئەوەی کە کوێت بگێڕدرێتەوە سەر خاکی عێراق نموونەیەکی بەرچاوی ئەو گیروگرفتانە بوو. شایەنی باسە مەلیک غازی ئیستگەیەکی لە کۆشکی ڕیحاب دامەزراند بوو، لە ڕێگەی ئەو ئیستگەیەوە کەوتبووە پروپاگەندەی ئەوەی کە کوێت بەشێکە لە خاکی عێراق و دەبێ بگێڕدرێتەوە بۆ باوەشی (نیشتمانی دایک) هەتا ئەگەر مەسەلەکە پێویستی بەچەک و شەڕ هەبێت. ئەمە لە کاتێکدا نوری ئەلسەعید لە تەموزی ساڵی ۱۹۳۲ کاتێک سەرۆکی وەزیرانی بوو نامەیەکی بۆ سیر فرانسیس هەمفریز نوێنەری بەرزی بەریتانی لە بەغدا نووسیبوو تیایدا دانی بەوە نابوو، کە عێراق ڕازییە بەدەستنیشانکردنەکەی ساڵی ۱۹۲۲ی نێوان عێراق و کوێت. ئەم بانگەشەیەی مەلیک غازی مەترسیەکەی هەر ئەوە نەبوو کە لە بەرزترین لێپرسراوی عێراقەوە دێت، بەڵکو زۆرتر ئەو مەترسیە لەوەدا بوو کە لەناو لەشکری عێراق و لە ڕیزی نەتەوەخوازەکانی عەرەبی عێراقیشدا ئەم بانگەشەیە بڵاوبووبووەوە. ڕۆژنامەکانی عێراق لە ساڵی ۱۹۳۲دا پڕی ئەو وتارانەن کە داوای سەرلەنوێ بەستنەوەی کوێت بەعێراق دەکات، لەو سەردەمەدا بەهانەی عێراق بۆ گێرانەوەی کوێت ئەوە بوو کە لەم وڵاتەوە بازرگانیی قاچاخ لەگەڵ عێراق دەکرێ و ئەم جۆرە بازرگانییە زیانێکی زۆر لە ئابووری عێراق دەدات، بۆ چارەسەرکردنی ئەم

کێشەیە میری کوێت لەو ساڵەدا سەردانی بەغدای کرد و پەیمانی ئەوەی بەلێپرسراوانی بەغدا دا، کە ئیتر ڕێگە لەم بازرگانییە قاچاخە بگیرێ. بەڵام عێراقییەکان هاتنی میری کوێتیان بەدەرفەت زانی بۆ ئەوەی داوای سەرلەنوێ دارشتنەوەی سنووری لێبکەن. میر ڕازی نەبوو، بەڵام ئەم حاڵە کۆتایی نەهات.

بگرە هەر لەو سەردەمەوە هەندێک لە فەلەستینییەکان و سورییەکان ئەم ئاوازەی مەلیک غازییان خۆش دەهاتە بەرگوێ: فەلەستینییەکان بەهۆی شاڵاوە بەردەوامەکانی جوولەکە بۆ فەلەستین، سوریەکانیش بەیادی لیوای ئەسکەندەروونە و ویلایەتی کۆنی بەیروت.

لەم کەشوهەوایەدا زۆری نەبرد مەلیک غازی بەڕووداوی ئۆتۆمۆبیل لە ساڵی ١٩٣٩وەفاتی کرد. هەندێ لە ناوەندە عەرەبییەکانی عێراق پێیان وا بوو ڕووداوەکە دەستی ئینگلیزی تێدا بوو، چونکە بەگوتەی ئەم ناوەندانە مەلیک غازی دەیویست عێراق لەژێر ڕکێف و دەسەڵاتی بەریتانیا بێنێتە دەرەوە. ئەمانە دروشمی گێڕانەوەی کوێت بۆ سەر خاکی عێراق بەیەک لە هۆیەکانی کۆتایی پێهێنانی ژیانی مەلیک غازی دەزانن.

ئەو ئاگرەی غازی نایەوە دیار بوو ڕووەو کوژانەوە نەدەچوو. هۆیەکەیش نەوت بوو، عێراق بەهۆی داهاتی نەوتەوە دەسەڵاتی خۆی قایم کرد بوو. چاوی لەوە بوو دەستی بەسەر میرنشینە بچووکەکانی کەنداو بڕوات. لەو لاوە دەست بەسەر گرتنی کوێت بۆ پادشاکانی عێراق سێ ئامانجی وەدەست دەهێنا:

یەک: نەوتە تازە دۆزراوەکەی ناوچەی کەنداو مایەی تەماحێکی گەورەی عێراقی پڕ کردۆتەوە.

دوو: کوێت دەرگایەکی فراوانی بۆ عێراق دابین دەکرد لەسەر ئاوی کەنداو.

سێ: بنەماڵەی شەریفی حیجاز دوورگەی عەرەبییان بەخاکی خۆیان

دەزانی و پێیـــان وابوو تیـرەکـانی دیکە بەخـەیانەت و هاوپەیمانکردنی ئینگلیز دەستیان بەسەر داگرتووە. ئیتر ئەوەی بنەماڵەی شەریفی حیجاز بەهۆی بنەمـاڵـەی ئال سعـودەوە لە دەستـی چوو بوو، لە عـێـراق و کـوێت بەدەستی دەهێناوە.

بەڵام دواتر دەرکەوت ئەم چاوتێبڕینەی عـێراق لە کوێت تەنیا خەونی پادشـاکـانی عـێراق نەبووە، بەڵکو خەونی ئەفسـەر و نەتەوەپەرستـەکانی عـەرەبی عـێـراقیش بووە. عـەبدولکەریم قـاسم سالّی ۱۹٦۱ کـێشـەیەکی گەورەی لەم بارەیەوە بەرپا کرد. دواتر بەعـسیـەکان لە دوای ۸ی شـوباتدا گێرمەو کێشەیان لەگەڵ کوێت تازە کردەوە. عەبدولسەلام محەمەد عـارف درێژەی بەهەمـان ڕێچکەدا، تا ئەوە بوو بەعـســیـەکـان جـارێکی دیکە لە ۱۹٦۸ هاتنەوە سەر کار.

دروشمەکانی بەعس لە بواری داواکردنەوەی کوێت جیاوازیەکی بەرچاوی هەبوو لەگەڵ داواکاریی لایەنە سیاسییەکانی دیکەی عێراق. ئەمانە وای بۆ دەچوون گـیـروگـرفـتـێکی سنووری هەیە لە ئارادا و کـوێت پێشـتـر لە سەردەمی عـوسـمـانییەکاندا سەر بەعێراق بووەو دەبێ پاش دامەزراندنی دەوڵەتی تازەی عـێراق بگێڕدرێتەوە ناو بازنە ئاسایییەکەی خۆی. کەچی بەعـسـییـەکان وای لێکدەدەنەوە کـە وڵاتە عـەرەبییـەکـان بەفـیت و پلانی دەوڵەتە کۆڵۆنیالەکان دابەش کراوە. مەبەستیش لەم دابەشکردنە ڕێگەگرتن بووە لە پەرەسـەندنی نەتەوەی عــەرەب. بۆیە ڕەنگە عــەرەب نەتـوانێت جارێکی دیکە پەرەبسێنێتەوە و بەیەکجارەکی لەژێر دەسەڵاتی سیاسی و ئابووری دەوڵـەتانی بێگانە ڕزگـاری ببـێت، ئەگـەر بێت و سـەرلەنوێ یەک نەگرێتەوە.

ڕەنگە یەکگرتن بۆ هەمـوو مـیللەتێکی بەش بەش کـراو داواکـارییـەکی ئاســایی و یاســایی بێت. بەڵام ئەوەی لە تاقـیـکردنەوەی بەعــــسدا ئەم مەسـەلەیە ناجۆر و نایاسایی دێنێتە بەرچاو ئەوەیە، کە بەعس پێی وایە بەچاکـە و گـفـتـوگـۆی سـیـاسی ئەم یەکگرتنە دروست نەبوو ئەوا دەبێت

بەزۆری زۆردارەکی و بەداگیرکردن و داپڵۆسین یەکگرتنەکە بەسەر نەتەوەی عەرەب فەرز بکرێت. بەڵگەشی بۆ ئەم جۆرە یەکگرتنە ئەوەیە کە هەرچی لە مێژووی تازەی عەرەبدا هەوڵ هەبوو بەیەکگرتن سەری نەگرتووە. هەروەها زۆر جار نەتەوە بەدید و بۆچوونی بەعسییەکان تووشی مردن و بێدەنگی دێت و بەرژەوەندییەکان و دوارۆژی خۆی بەدیقەت ناخوێنێتەوە. بۆیە ئەرکی (سەرکردایەتی مێژوویی) بەعس ئەوەیە بەزەبری گورز و داگیرکردن چاوی نەتەوەی عەرەب بکاتەوە.

## داگیرکردنی کوێت

## ئێستگەی جودابوونەوەیەکی قووڵ

راستە، داگیرکردنی کوێت لە ساڵی ١٩٩١دا، پەیوەندی بەئابووری و نەوت و قەرز و قۆڵەکانی عێراقەوە هەبوو. هەروەهاپەیوەندی بەتەماحەکانی بەغداوە هەبوو بۆ هەڵکشان بەرەو ئاوی کەنداو و بیرە نەوتەکانی کەنداو . بەڵام زۆرتر پەیوەندی بەو بۆچوونەی بەعسەوە هەبوو کە پێی وایە داگیرکردنی کوێت هەنگاوی یەکەم پێک دەهێنێ بۆ یەکگرتنەوەی دەوڵەتە عەرەبییەکان. ئەمەش وە نەبێ تەنیا دیدی بەعسی عێراق بێت، یان دیدێکی سیاسی تازە بێت، بەڵکو بەسمارکی ئەڵەمانی کە یەک لە سەرکردە نەتەوەییە توندڕەوەکانی ئەڵەمانەکان بوو، کاتی خۆی هەمان بۆچوونی هەبوو لەمەڕ یەکخستنەوەی دەوڵەتی ئەڵمانیاوە.

لە ڕاستیدا هاتنی بەعس بۆ سەر حوکمی فەرمانڕەوایەتی هەر لە ساڵی ١٩٦٨ەوە ئەم چاوبڕینەی پێوە دیار بوو لە کوێت. ڕەنگە خۆپاراستنی لێپرسراوە گەورەکانی عێراق لە سەردانی کوێت بەدرێژایی مێژووی دروستبوونی ئەو دوو دەوڵەتە، یەک لەو دیاردانە بێت کە ئەم لێپرسراوانە نەیانویستووە بەئاشکرا دان بەسەربەخۆیەتی ئەو میرنشینەی کەنداوەوە بنێن. دواتریش هەموو بۆنە و ڕووداوێکیان قۆزتۆتەوە بۆ تاوانبارکردنی سعودیە و کوێت بەکۆنەپەرستیتی و ئەڵقە لە گوێیی بۆ ئەمەریکا و بەریتانیا.

لەولاوە هەتا بۆیان کرابێت هانی خەڵکانی دژ بەکوێت و سعودییان داوە تا لە ڕووی وڵاتەکانی خۆیان هەڵگەڕێنەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا هەوڵی ئەوەشیان داوە پەیوەندییە ڕەسمیەکەی خۆیان لەگەڵ ئەو میرنشینانە نەگاتە ڕادەی پچڕان بەتایبەتی لەو سەردەمانەی کە بەریتانیا و ئەمەریکا دەسەڵاتێکی سیاسی و ئابوورییان لە ناو عێراقدا هەبووە.

کاتێک لە سەرەتای حەفتاکاندا ئینگلیز لە ناوچەی کەنداو کشایەوە، بۆ ماوەیەکی کەم عێراق وای زانی ئیتر ڕێگە تەخت بوو لە بەردەمی هەڵکشانیدا بۆ ناوچەکە. بەڵام زۆری نەبرد ئێران جێگەی بەریتانیای گرتەوە و محەمەد ڕەزا شا دەستی بەسەر سێ دورگە گرنگەکەی ناوچەی کەنداودا گرت. ئەم ڕووداوە زەبرێکی گەورەی لە بەرژەوەندییەکانی عێراقدا بەتایبەتی لەو سەردەمەدا نێوانی بەغدا و تاران تا دەهات ناخۆشتر دەبوو.

لەم ساڵانە بەسەرەوە، بەغدا دیار بوو هەوڵێکی زۆری دەدا پەیوەندییەکانی لەگەڵ میرنشینانی کەنداو تووشی هیچ گیروگرفتێکی ئەوتۆ نەیەت بەهۆی تاوسەندنی ناکۆکییەکانی لەگەڵ ئێران. بۆیە لە ساڵانی ۱۹۷۲ و ۱۹۷۳ و ۱۹۷٤دا بەهەر دوو شێوە ڕەفتاری لەگەڵ سعودیە و کوێت دەکرد: لەلایەکەوە دوژمنایەتیی دەکردن و لەلایەکی دیکەشەوە دۆستایەتی. تا ئەوە بوو ڕژێمی شا لە ئێران ڕووخا و ڕژێمی ئیسلامی هاتە سەر حوکم لە ۱۹۷۹دا.

لە ڕاستیدا شۆڕشە ئیسلامییەکەی ئێران مەترسییەکی گەورەی بۆ سەر سعودیە و کوێت دروست کرد، چونکە هەر دوو وڵاتەکە کەمینەیەکی گەورەی شیعەیان لێیە. هەروەها هەردووکیان لەگەڵ ئەمەریکا و ڕۆژئاوا تەبا و ڕێکن، کە ئەمە مایەی نیگەرانیەکی گەورە بوو بۆ وڵاتانی کەنداو. بێجگە لەم دوو هۆیە سعودیە خۆی بەمەڵبەندە سەرەکییەکەی ئیسلام دەزانێت، کەچی لەولاوە ڕاست بوونەوەی ئێرانێکی ئیسلامی هەڕەشەی لاوازکردنی ئەو مەڵبەندەی لێدەکرد.

لێرەوە هەر دوو وڵاتەکە هەر زوو بازیان بەسەر ناکۆکییەکانی خۆیان دا لەگەڵ عێراق و کەوتنە نزیک بوونەوە لەگەڵ بەغدا.

دواتر کە شەڕی عێراق و ئێران دامەزرا پشتگیرییەکی بێ پایانی عێراقیان کرد لەو شەڕەدا. بگرە عێراقیش لە باری خۆیەوە هەموو ناکۆکییەکانی خۆی لەگەڵ دەوڵەتانی کەنداو خستە لاوە و کەوتە مشوور

خواردنی دابینکردنی خەزێنەی شەڕ لە هەردوو وڵاتەکە. لە ماوەی ساڵانی شەڕ سعودیە لە جیاتی عێراق نەوتی دەفرۆشت پارەکەی تەحویلی بەغدا دەکرد. هەروەها لە جیاتی بەغدا چەک و تەقەمەنی لە بازاڕی دەوڵەتیی دەکڕی. کوێتیش لە بواری یارمەتیدانی ئابووری ڕۆڵێکی گرنگی گێڕا لە ڕاگرتنی لەنگەرەکانی ئابووری عێراق لە ماوەی شەڕدا.

ساڵانی شەڕی تاران و بەغدا خۆشترین ماوەی پەیوەندی بوو لە نێوان بەغدا و پایتەختە عەرەبییەکانی کەنداودا. هەر لەو ماوەیەدا سەعودییەکان توانیان بەغدا قەناعەت پێبکەن بەکۆتایی پێهێنانی کێشەی سنوور لە نێوانیاندا بەوەی کە ناوچەی (الربع الخالي) کە ناوچەیەکی بێ لایەن بوو لە نێوان هەردوو وڵاتدا، بخرێتە سەر دەوڵەتی سعودی. لە ڕاستیدا کوێتیەکانیش چاویان لەوە بوو ئەو پشتگیرییەی عێراق نرخەکەی چارەسەرکردنی کێشەی سنوور بێت لە نێوانیاندا. بەڵام دیار بوو بەقەدەر سعودیان پێنەکرا و لە ئەنجامدا ڕازیبوون بەبێدەنگ بوونی بەغدا لە بواری داواکردنەوەی هەر دوو دوورگەی بۆبیان و وەربە. شایەنی گوتنە عێراق هەر لە سەرەتای چلەکانەوە وازی لە داواکردنەوەی تەواوی کوێت هێنابوو، غەیری ئەو چەند ساڵەی حوکمی عەبدولکەریم قاسم نەبێت. زۆرتر داوای بۆبیان و وەربەی دەکرد. هەندێ جار باسی ئەوەیشی دەکرد بەڵکو حکومەتی کوێت قەناعەت بکات بەوەی هەر دوو دوورگەکە بەکرێ بدرێتە عێراق بۆ ماوەی نەوەد و نۆ ساڵ.

تەواوبوونی شەڕی عێراق و ئێران کەشوهەوایەکی سیاسیی تازەی لە ناوچەکەدا هێنایە گۆڕێ. گەورەترین دیاردەی ئەو کەشوهەوا تازەیە ئەو سەرکەوتنە عەسکەرییە بوو کە عێراق لە ئەنجامی هەشت ساڵ شەڕ لە دژی ئێران بەدەستی هێنا. هەروەها دیاردەیەکی دیکەی کۆتایی هاتنی شەڕ بەهێزبوونی دەسەڵاتە سەربازییەکەی عێراق بوو، بەتایبەتی لە ڕووی وەدەست هێنانی جبەخانەیەکی گەورەی چەکی کیمیاوی و بایەلۆژی و، هەنگاونانی بەغدا بوو بەرەو دروستکردنی چەکی ئەتۆمیش. لەولاوە

عێراق بوو بووە خاوەن لەشکرێکی یەک ملیۆن سەربازی. لەشکرێک کە تاقیکردنەوەیەکی زۆری لە بواری شەڕ و داگیرکردندا پەیدا کردبوو چ لە شەڕی کوردستان و چ لە شەڕی ئێراندا.

هەر شان بەشانی ئەم کەشوهەوایەش، دیاربوو لە دوا دوای هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو گۆڕانکاریەکی گەورە بەسەر سیستەمی سیاسەتدا دەهات لە تەواوی جیهاندا. گۆڕانکارییەکەش وەک ئەوسا سەرەتاکەی دەرکەوتبوو، پشێوی و بەرەو ڕووخان ڕۆیشتنی بلۆکی سوسیالیزمی بوو. لێرەوە دەوڵەتانی کەنداو کەوتبوونە مشووری ئەوەی چۆن ئاسایشی ناوچەکە بپارێزن. لەم بوارەدا ئەمەریکا و بەریتانیاش یارمەتیی دەدان، بەڵام دیار بوو نەخشە سەرەکییەکانی ئەو ئاسایشە ستراتیژییەی ناوچەی کەنداو نە عێراقی تێدا بوو نە ئێران. بۆیە عێراقی سەرکەوتوو لە شەڕی ئێران خۆی بەیەکەم خاوەنی هەق دەزانی نەک هەر لە بەشداریکردن لە بازنەی ئەو ئاسایشەدا، بەڵکو بۆ بەڕێوەبردن و سەرکردایەتی کردنیشدا.

لێرەوە گرێی ترسێکی تازە کەوتە نێوان عێراق و دەوڵەتانی کەنداو. ڕووخانی سیستەمی دوو بلۆکیی ئەم ترسەی زیاد کرد.

ڕاست نییە وەک هەندێ بۆی دەچن کە سەرکردایەتییەکەی عێراق ئەم هەلومەرجە تازەیەی جیهانی لەبەرچاو نەگرتبوو، کاتێ بڕیاری داگیرکردنی کوێتی دا. بەڵکو ڕاست ئەوەیە کە سەرکردایەتییەکە پێی وا بوو هەڵوەشانەوەی سیستەمی کۆنی جیهان لە لایەک ئەمەریکا سەرقاڵ دەکات بەگیروگرفتێکی گەورەترەوە. هەروەها دەمارگیرییەکی سیاسی ئەوتۆ لە جیهاندا دروست دەکات کە ڕێگری هەڵوەشانەوەی سیستەمە کۆنەکە بێت، ئینجا خۆ ئەگەر سیستەمەکەش ڕووخا، ئەوا واشنتۆن ڕوو دەکاتە چەند دەوڵەتێکی ناوچەیی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بۆ پەیدا کردنی باڵا دەستی. عێراقیش بەپێی سەرکردایەتییەکەی بەغدا یەک لەو وڵاتانە دەبێت کە ڕەنگە ئەمەریکاییەکان ئەو حیسابەی بۆ بکەن، بەتایبەتی ئەگەر کوێتی داگیر کرد لەو بڕگە ناسکەی جیهاندا ئەمرێکی واقیعی بەسەر واشنتۆن و

دەوڵەتانی ڕۆژئاوا سەپاند.

بەغدا مەبەستی بوو بەپەیوەندییەکی گەرم لەگەڵ سعودییەکان بپارێزێ، هەر بۆ ئەوەی درزێک بخاتە دیواری ئەو نزیکیەی لە نێوان دەوڵەتانی کەنداودا هەبوو، زۆر جار لەم ماوەیەدا بەغدا سعودیەکانی بەکار دەهێنا بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی لەگەڵ ئەمریکاییەکان.

هەوەڵین کێشەی نێوان کوێت و بەغدا لەم ماوەیەدا لە سەرەتای ساڵی ١٩٩٠ دەستی پێکرد کاتێک نرخی نەوت لە بازاڕە جیهانیەکاندا ڕووی لە نزمبوونەوە کردبوو. عێراق وای لێکدایەوە نزمبوونەوەی نرخی نەوت بەهۆی زیادکردنی فرۆشتنی نەوتە لەلایەن کوێت و دەوڵەتی ئیماراتی عەرەبییەوە. بەڵام لە ڕاستیدا ئەم لێکدانەوەیەی عێراق بەهانە بوو بۆ داپۆشینی هەوڵ و تەقەللاکانی بۆ تاوپێدانی گیروگرفتەکانی لەگەڵ کوێت.

دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر لە لایەن سعودیە و میسرەوە بۆ ڕێگەگرتن لە ناکۆکییەکانی نێوان بەغدا و کوێت، عێراق لە ٢ی ئابی ١٩٩٠دا هێرشێکی سەربازی کتوپڕی کردە سەر کوێت و لە ماوەیەکی کەمدا داگیری کرد. ئەم داگیرکردنە نەک هەر سەرەتای پەیوەندیەکی تازەی پڕ دوژمنایەتی بوو لە نێوان عێراق و کوێت، بگرە سەرەتای قۆناغێکی پڕ دوژمنایەتیش بوو لە نێوان عێراق و دەوڵەتانی کەنداو، عێراق و دەوڵەتانی ڕۆژئاوا بەئەمەریکاوە، عێراق و دەوڵەتە عەرەبییەکان و زۆربەی هەرە زۆری جیهان. یەک لە زیانە گەورەکانی عێراق لەو شەڕەدا ئەو دوژمنکارییە بوو کە لەگەڵ سعودیەدا دروستی کرد. تا پێش داگیرکردنی کوێت بەغدا توانیبووی پەیوەندییەکانی خۆی بەئاسایی لەگەڵ سعودیە بپارێزێ. بەڵام دوای داگیرکردن بەچەند ڕۆژێکی کەم هێزە سەربازییەکانی عێراق ڕووەو سنووری سەعودیە ڕۆیشتن. ئەمەریکاییەکان هەستیان بەو جموجوڵەی عێراق کرد. بۆیە بەپەلە سعودیەکانیان ئاگادار کردەوە. سعودیەکان هیچ جۆرە باوەڕێکیان بەبەغدا نەما بوو، بۆیە بەدووریان نەزانی لەپڕ لەشکری عێراق بەرەو کەنارە سعودیەکەی کەنداو بڕوات و بیەوێ لەوێشەوە بگاتە

دەوڵەتی ئیماراتی عەرەبی. لەژێر پاڵەپەستۆی ئەم ترسە بەپەلە داوای یارمەتیی سەربازییان لە ئەمەریکا کرد. بەڵام ئەمەریکاییەکان مەرجیان ئەوەبوو بەرگرتن لە هێرشێکی عێراق بۆ سەر سعودیە پێویستیی بەدەرکردنی لەشکری عێراق هەیە لە کوێت. لێرەوە سعودییەکان بۆ یەکەم جار لە مێژووی دەوڵەتی سعودی دا ڕازی بوون لەشکرێکی بێگانەی غەیرە ئیسلام نەک هەر پێ بنێتە سەر خاکەکەیان بەڵکو خۆیشی مۆڵ بدات و هێرشێکی بەرفراوان بۆ ڕزگارکردنی کوێت لە خاکی سعودیەوە دەست پێ بکات. ئەوە بوو شەڕی ڕزگارکردنی کوێت لە ١٦ کانونی دووەم ١٩٩١ دەستی پێکرد و لە ٢٧ی شوباتی هەمان ساڵ تەواو بوو.

دوای تەواو بوونی شەڕ دەوڵەتی عێراق بەیەکجارەکی پەڕپووت بوو بوو لە هەموو بوارەکاندا، بەتایبەتی بواری سەربازی و سیاسی. ئینجا ڕاپەڕینەکانی کوردستان و خوارووی عێراق گورزێکی کوشندەی دیکەیان لە ڕژێمە سیاسیەکەی دا. دواتر ڕاگەیاندنی ناوچەی ئاسایش لە کوردستانی عێراق و ناوچەی دژە فڕین لە خوارووی عێراق بەیەکجارەکی لەنگەری عێراقی تێکدا.

ئەوەی زۆرتریش عێراقی خستە مەترسییەوە ئەوە بوو کە سعودی و کوێتیەکان تەنیا بەڕزگارکردنی کوێت لە کوێت و پێوەندی سەربازیی عێراق نەوەستان، بەڵکو لە ئاستی عەرەبی و جیهانی و ناوچەییشدا کەوتنە چالاکییەکی سیاسی و میدیایی زۆر بەگۆشەگیرکردنی عێراق و درێژە پێدانی سزاکانی. هۆیەکەشیان بۆ ئەم سیاسەتە ئەوە بوو کە عێراق خاوەنی جبەخانەیەکی گەورەی چەکی کۆمەڵکوژە و ئەگەر بێت و ئەو چەکانەی لێ دانەماڵرێ و ڕژێمە سیاسییەکەی نەگۆڕدرێ، ئەوا ترسی داگیرکردن و خاپوورکردن بەسەر کەنداو هەر دەمێنێ، بۆیە هاوکارییەکی سەربازیی ستراتیژی و درێژخایەنیان لەگەڵ ئەمەریکا و بەریتانیا بەست.

هەروەها هەرچی توانایەکیان هەیە خستیانە کار بۆ درێژەپێدانی سزاکان.

لەو لای دیکەوە پەیوەندییان گەرم کردەوە لەگەڵ ئێران. هەوڵێکی

زۆریان دا بۆ دوورخستنەوەی ئەو هێز و دەوڵەتانەی کە لەکاتی داگیرکردنی کویتدا پشتگیری عێراقیان کردبوو وەک ئوردن و یەمەن و سودان و فەلەستینییەکان.

## سزا دەوڵەتییەکان

ئەنجوومەنی ئاسایش لە ٣ی نیسانی ساڵی ١٩٩١ بڕیاری ٦٨٧ی دەرکرد لە بارەی پابەند بوونی عێراق بەڕاگرتنی شەڕەوە. ئەوە بوو عێراق لە ٦ی هەمان مانگدا موافەقەتی لەسەر بڕیارەکە کرد.

پێش ئەم بڕیارە هەر لە دوای داگیرکردنی کویتەوە بڕیارێکی توندی سزای دەوڵەتیی بەسەر عێراق فەرز کرابوو.

ئەم بڕیارانە لە دەقەکانیاندا باسی کویتیان وەک دەوڵەتێکی سەربەخۆ دەکرد. هەروەها مەودایەکی گەورەشیان لەبەردەم کویتییەکان و سعودییەکان خۆش کرد بۆ درێژە پێدانی سیاسەتی گۆشەگیرکردنی عێراق، بەتایبەتی کە ئیتر کویتییەکان دەستیان کرد بەبەکارهێنانی مەسەلەی دیلەکانی داگیرکردن لە دژی بەغدا.

لەم بوارەدا ڕەنگە کویتییەکان و سعودییەکان زۆرتر تالبی ئەوە بن سزا دەوڵەتییەکان بەڕووخاندنی ڕژێمی ئێستای عێراق ببەسترێنەوە. چونکە مانەوەی ئەم ڕژێمە لە دوای ١٩٩٠ەوە بەشێوەیەکی سەرەکی ئەمن و ئاسایشی ئەوان دەخاتە مەترسیەوە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەست بەوە دەکرێ کە ڕەنگە هەر دوو ئەم دەوڵەتەی کەنداو زۆرتر پێیان باش بێت سزاکان تەنیا وەک سزایەک کار لە بارودۆخی عێراق بکەن، نەک وەک ئامرازێک یان چەکێک لە چەکەکانی ڕووخاندنی ڕژێمی عێراق. هۆیە سەرەکییەکانی ئەو جیاوازیەش لە بواری ویست و پراکتیکدا لەلای ئەم دوو دەوڵەتە پابەندە بەچەند ترسێکەوە:

یەکەم: لەوەی عێراق تۆڵەی هەر پشتگیرییەکی ئەم جۆرە سیاسەتەیان

لێ بکاتەوە، بەتایبەتی تا ئێستا ئەمەریکا سوورە لەسەر ئەوەی کە عێراق جبەخانەیەکی گەورە و نادیاری چەکی کۆمەڵکوژی هەیە.

دووەم: لە ترسی ئەوەی نەوەکا دەوڵەتە عەرەبییەکان لە ڕوویان هەستنەوە و تۆمەتباریان بکەن بەوەی کە دەست لە کاروباری ناوەخۆی دەوڵەتێکی دیکەی عەرەبییەوە وەردەدەن.

سێیەم: خەمی ئەوەیانە نەوەکا هەر ڕووخانێکی ڕژێمی ئێستای عێراق ببێتە مایەی بەرپابوونی شەڕێکی ناوەخۆ لە عێراقدا، کە ئەمە ڕەنگدانەوەیەکی خراپی دەبێت بۆ سەر بارودۆخی ناوەکی دەوڵەتانی کەنداو.

چوارەم: خەمی ئەوەشیانە نەوەکا ڕووخانی ڕژێمی عێراق ببێتە سەرەتایەک بۆ هەڵوەشانەوەی دەوڵەت و خاک و یەکێتیی عێراق.

لێرەشدا ڕەنگە ترسی گەورەیان کورد و دەوڵەتی کورد نەبێت، بەڵکو ترسی گەورەیان دروستبوونی دەوڵەتێک یان کیانێکی شیعییە لە خوارووی عێراق، واتە لەسەر سنووری سعودی و کوێتدا.

بێجگە لەم ترسانە، جار جار هەر دوو دەوڵەت بەتایبەتی سعودیە ناڕەزاییەکی ئاشکرا لەوە دەردەبڕێ کە ئەمەریکا بەشێوەی سەربازی وەڵامی هەر سەرپێچی کردنێکی عێراق بداتەوە لە بڕیارە دەوڵەتییەکان. لەم بوارەدا سعودییەکان پێیان وایە لێدانی عێراق بەشێوەی ناکاریگەر لە بەرژەوەندیی بەغدا دایە نەک لە زیانی، چونکە دەبێتە هۆی گەشەپێدانی گیانی پشتگیریی عێراق لەناو عەرەب و دەوڵەتانی ئیسلام و جیهاندا. بەڵام ئەگەر بێت و ئەمەریکاییەکان بەنیازی لێدانێکی یەکجارەکی و بەهێز بن کە ئەنجامەکەی بەلابردنی ڕژێم و زامنکردنی یەکێتیی عێراق بشکێتەوە؛ ئەوا ڕەنگە بێ یەک و دوو پشتگیریی لەم جۆرە سیاسەتە بکەن.

بەڵام گرنگتر لەو ڕاستیانەی سەرەوە ئەوەیە، کە دیارە داگیرکردنی کوێت

و هەڕەشەکردن لە سعودیە، بۆشاییيەکی گەورەی ئەوتۆی لە نێوان عێراق و دەوڵەتانی کەنداودا دروست کردووە کە ڕەنگە پڕکردنەوەی کارێکی ئاسان نەبێت. هەنگاو هەڵهێنانی هەندێ لە دەوڵەتانی کەنداو، بەتایبەتی دەوڵەتی ئیماراتی عەرەبی و قەتەر و بەحرێن، بەرەو ئاساییکردنەوەی هەندێ لە پەیوەندییە ئابوورییەکانیان لەگەڵ بەغدا لەو ڕاستیەی سەرەوە ناگۆڕێ، چونکە ئامانجە سەرەکیەکەی ئەو سیاسەتەی ئەبو زەبی و دەوحە و مەنامە سەرلەنوێ بەگوڕ خستنەوەی عێراق نییە، بەڵکو لەنگەر ڕاگرتنە لەگەڵ ئێران. ئەم سێ دەوڵەتە هەر یەکەی بەشێوەیەک ناکۆکییەکی بەرچاویان لە نێواندایە لەگەڵ تاران. بگرە مەترسیی ئەوەشیان هەیە درێژە کێشانی گۆشەگیرییەکەی عێراق لە ئەنجامدا بەوە بشکێتەوە ئێران لە ناوچەکەدا دەسەلاتێکی گەورە پەیدا بکات. بۆیە پێیان چاکە ئەو لەنگەرەی ئێران بەعێراق ڕابگیرێ. بەڵام بڕیاردەری سەرەکی لە سیاسەتی کەنداودا ئەم سێ دەوڵەتە نین، بەڵکو سعودی و ئینجا کوێتن. بۆیە هەر چییەکی ئەم سێ دەوڵەتە دەیکەن لە بەرامبەر عێراق، نە ئەنجامێکی ئەوتۆ دەدا بەدەستەوە و نە عێراقیشی پێ کەیفخۆش دەبێت.

بێگومان نەوت دەورێکی گرنگی هەیە لە پێوانەی ناکۆکییەکانی عێراق لە لایەک و کوێت و سعودیەدا. بگرە داگیرکردنی کوێت لە ١٩٩٠دا پێوەندییەکی بەمەسەلەی نەوتەوە هەبوو. بەڵام لە هەمان کاتدا دەوری نەوت لە ناکۆکییەکاندا نەک بەقازانجی بەڵکو بەزیانی عێراق شکاوەتەوە.

دوای داگیرکردنی کوێت، سعودیە بەپەلە کەوتە زیادکردنی بەرهەم هێنان و فرۆشتنی نەوت. مەبەست لەم هەنگاوەی سعودی سێ شت بوو:

یەکەم- دابینکردنی پێداویستییەکانی بازاڕی جیهانیی نەوت لەو کاتەی نەوتی عێراق و کوێت لە ئەنجامی شەڕ ڕاوەستابوو.

دووەم- کڕینی چەک و تەقەمەنی و تەکنەلۆژیای تازەی شەڕ بەڕاگرتنەوەی ئەو پێوانەی هێزەکە لە نێوان سعودیە و عێراق تێکچوو بەداگیرکردنی کوێت.

سێیەم: دابینکردنی هەندێک لە بودجەی شەڕی کوێت و پاراستنی سعودی لە لایەن هێزە دەوڵەتییەکانەوە.

بەڵام لە ڕاستیدا ئەو هەنگاوەی سعودی قازانجێکی دیکەشی هەبوو، ئەویش ئەوەبوو کە ئابووری سعودی خۆی لە خۆیدا تووشی کۆمەڵێک گیروگرفت هاتبوو و پێویستی بەدەرامەت و داهاتێکی تازە هەبوو بۆ چارەسەرکردنیان. بۆیە شەڕی کوێت و ڕاوەستانی نەوتی عێراق و کوێت بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ قازانجی ئابووری ئەوی تێدا بوو. دواتر کە بڕیاری سووککردنی باری خەڵکی عێراق لە لایەن ئەنجوومەنی ئاسایشەوە دەرچوو، بەوەی کە ڕێگە بدرێ عێراق بەشێک لە نەوتی خۆی لە ژێر چاوەدێری نەتەوە یەکگرتووەکان بفرۆشێ، دیار بوو حسێب بۆ ئەوە کرابوو ڕادە تازەی فرۆشتنی نەوتی سعودی زەرەرمەند نەبێت.

بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو ڕاستییانە مەترسییەکانی دەوڵەتانی کەنداو لە گەشەکردنی هێزی عەسکەری و سیاسیی عێراق هۆی سەرەکی ئەو پێ داگرتنەیانە لەسەر پێویستی درێژەکێشانی سزا دەوڵەتییەکان بەسەر عێراقەوە.

## پەیوەندییەکانی عێراق و کەنداو بۆ کوێ؟

ئەوی ڕاستی بێت چۆنیەتی پەیوەندییەکانی عێراق و کەنداو بەردێکی گەورەی بناغەی ئەمن و ئاسایشە لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، بگرە زۆرجار سروشتی ئەم پەیوەندییانە کارێکی زۆر لە ئەمن و ئاسایشی جیهانیش دەکات، وەک لە سەردەمی شەڕی کوێتدا دەرکەوت. بۆیە لە دوارۆژدا دەبێت وڵاتانی خاوەن بەرژەوەندی لەو ناوچەیە خەمێکی تەواوی چۆنیەتی هێورکردنەوەی ئەم پەیوەندییانە بخۆن.

لێرەدا پرسیار ئەوەیە: ئایا دەکرێ ئەم پەیوەندییانە هێور ببنەوە لە کاتێکدا ڕژێمەکەی ئێستای عێراق هەر لەسەر حوکم بێت؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە لای کوێتییەکان و سعودییەکان (نە ء)ە.

ڕەنگە ئەمەریکایی و بەریتانییەکانیش هەمان (نەء)یان هەبێت. بەڵام گیروگرفتی گەورە لەم نێوانەدا ئەوەیە کە عێراق تاکە ڕەگەزی ئەو کێشەیە نییە. بەڵکو هەندێ جار ئێرانیشی تێ دەکەوێت. لەولاوە فشار و سیاسەتەکانی دەوڵەتە عەرەبییەکان ڕۆڵێکی گرنگ لەو ناوچەیەدا دەگێڕێت. هەروەها شەڕ و پێکدادانەکانی عەرەب و ئیسرائیلیش بڕیاردەرێکی گرنگی ئەو ئاسایشەیە.

ئەوەندەی بابەتەکە پەیوەندیی بەعێراقەوە هەبێت، پێناچێت تا ئەو ڕژێمەی ئێستا لەسەر حوکم بێت هیچ جۆرە نێوان خۆشیەکی ڕاستەقینە لە بەینی بەغدا و کوێت و ڕیاز دروست بێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕەنگە دوارۆژ ئەگەر ڕژێمەکەی بەغدا نەڕووخا، تا ڕادەیەک هێمنیی بکەوێتەوە نێوانیانەوە بەتایبەتی بەهۆی تاوسەندنی کێشەی ئیسرائیل و فەلەستین و فشاری عەرەب بۆ لە بیرکردنی ناکۆکییە ناوخۆییەکان لە بەرامبەر مەترسیەکانی ئیسرائیل بۆ سەر نەتەوەی عەرەب. هەروەها ئەگەر پەیوەندییەکانی دەوڵەتانی کەنداو و ئێران تووشی ناخۆشیەکی گەورە بێت، ڕەنگە لەگەڵ عێراق جۆرە هێمنییەک دروست بێت. خۆ ئەگەر ئێران بتوانێت جبەخانەیەکی ترسناکی چەکی کۆمەڵکوژ دروست بکات و لەگەڵ ئەمەریکاییەکان پەیوەندیی بەرەو خراپە و ئاڵۆزی بڕوات ئەوا کوێت و سعودیە لە بەرامبەر مەترسیەکانی ئێرانیکی توندڕەو تا ڕادەیەک دەکرێت پەیوەندیەکانیان ئاسایی بکەنەوە لەگەڵ بەغدا. بەڵام لە ئەنجامی دواییدا ئەم پەیوەندیانە هەر سارد و سڕ دەمێننەوە و بگرە نەهەر هیچ گۆڕانکارییەکی دراماتیکی بەسەر ناوچەکەدا نەیەت، ئەم پەیوەندیانە ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو ئاڵۆزبوونی زۆرتریش بڕۆن.

بەنیسبەت عێراقی دوارۆژیش، واتە عێراقی دوای ڕووخانی ڕژێمی ئێستای، ڕەنگە وەزعەکە گۆڕانکارییەکی زۆری بەسەر نەیەت، چونکە شەڕی کوێت ڕاستیەکی گەورەی بۆ دەوڵەتانی کەنداو سەلماند، ئەویش هەبوونی عێراقێکی بەهێز و پڕ چەک و خاوەن ئابووریەکی توند ڕەنگە

زیانی لە قازانجەکانی زۆرتر بێت بۆ ناوچەی کەنداو. هەروەها کوێتییەکان باوەڕێکی ئەوتۆیان پەیدا کردووە کە مەسەلەی داگیرکردنی کوێت مەسەلەیەکە پابەند نییە بەڕژێمی ئێستای عێراقەوە، بەڵکو خەونێکی درێژخایەنی هەموو عێراقە بەحکومەت و دەوڵەت و ئوپۆزسیۆنەوە. بەڵگەشیان لەم بوارەدا ئەوەیە کە لەوەتەی کوێت داگیرکرا و ڕزگار کراوە تا ئێستا هیچ گرووپێکی عێراقی، غەیری کورد و هەندێ لایەنی حزبە ئیسلامیەکانی شیعە نەبێت، بەڕاشکاوی دانیان بەهێڵی سنووری دەوڵەتی کوێت نەناوە.

لەو لاوە درێژە کێشانی ناکۆکیەکانی نێوان عێراقی ئێستا و داهاتوو لەگەڵ کەنداو زەمینەیەکی لەبار بۆ درێژە کێشانی سیاسەتی ناوچە ئاسایشەکانی خوارووی عێراق و کوردستان دروست دەکەن، واتە تا ئەو کێشانە مابن، یان وردتر تا ئەو ڕژێمەی ئێستای عێراق مابێت زەحمەتە ڕۆژئاوا دەست لەو دوو ناوچە ئاسایشە بکێشێتەوە.

بۆیە پێناچێت تا ماوەیەکی درێژی دیکە ئەو گرفتانەی کەنداو بەزیانی کورد بشکێنەوە. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە ئێستا کورد بووەتە ڕەگەزێکی گرنگی ئەو سیاسەتەی ئەمەریکاییەکان بەسیاسەتی باکووری کەنداو ناوی دەبەن و دام و دەزگای تایبەتیشیان بۆ بەڕێوەبردنی دروست کردووە.

## تورکیا و عێراق
## مەوداکانی پێکگەیشتن و لێکدابڕان

عـێـراق و تورکـیـا دوو دەوڵـەتی گـرنگی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی نـاوەڕاستن. هاوسنوور و هاوئایین و هاومـەزەبن. بگرە لەوانەش گـرنگتـر، سـەر بەیەک سەرچاوەی ئایدیۆلۆژیی نەتەوەیین: کەمالیزم لە تورکیا و بەعسیزم عەرەبی لە عـێـراق ئەم دوو دەوڵەتە بەدرێژایی هەشـتـا سـاڵی ڕابردوو هاوکـار و هاوتەبا بوون، بێـجـگە لە چەند سـاڵی یەکـەمی دامـەزراندنی هەردوو دەوڵەتەکە لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی ڕابردوو و بێجگە لەم دە ساڵەی دوایی. واتە لە داگیرکردنی کوێتەوە تا ئێستا نەبێت.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، پەیوەندییەکانی دوو دەوڵەتەکە سروشتێکی ئاڵۆز و تێکەڵ و پێکەڵی هەبوو. هەندێکـیـان بەهۆی فـشـاری دەرەوە، هەندێکیشیان بەهۆی هەلومەرجە ناوەخۆیییەکانی ناو عێراق و تورکیایە.

لە سـەرەتای دامـەزراندنی دەوڵـەتی عـێـراق لە ۱۹۲۰-۱۹۲۵ ناکۆکـییەکی ئاشکرا و زەق کەوتە نێوانیـانەوە بەهۆی کێشـەی ویلایەتی موسڵ (کوردستانی خواروو) دواتر بەتایبەتی پاش ساڵی ۱۹۵۸ ڕووگەی سیاسی ناوەخۆ و هاوپەیمانێتی دەوڵەتی بەغدا و ئەنقەرەی تا ڕادەیەک لە یەکدی جیا کردەوە. بەغدا لەژێر پاڵەپەستۆی کودەتا عەسکەر و ناکۆکییە سیاسییە ناوەکییەکانیدا زۆرتر بەرەو چەپ و بلۆکی ڕۆژهەڵاتیی ڕۆیشت، بێجگە لە هەندێک ماوەی پچرپچڕ نەبێ کە تیایدا ڕووی لە بەرەی ڕۆژئاوا دەکـرد. کـەچی ئەنقـەرە لە بواری هاوپەیمانێـتـیـدا هەر لە دوای ڕێککەوتننامـەی لۆزان ۱۹۲۳ەوە. پەیوەندییـەکی توندی هەمـەلایەنەی لەگـەڵ ڕۆژئاوادا بەست. دواتر بووە ئەندامی هاوپەیمانێـتی سـەنتـۆ و (پەیمانی بەغـدا) و ناتۆ. لەگـەڵ ئیـسـرائیل و ئەمـەریکاش کـەوتە پەیوەندییەکی زۆر توند و قووڵەوە.

ئەم هاوپەیمانێـتـیـیـە دەوڵەتیـیـە، سـەرەڕای سروشـتـە عـیلمـانیـە

توندوزەقەکەی کەمالیزم، وایان کرد تورک زۆرتر بەلای پێناسەیەکی ئەوروپیدا بگەڕێ. کەچی لە عێراقدا تا ئێستاش پێناسەی ئیسلامی و کەلتووری عەرەب و خۆ بەستنەوە بەپێناسەی ڕۆژهەلاتی زاڵ و باڵا دەستە چ لە دابونەریتی ناو خەڵکیدا و چ لەناو دەستوور و یاساکان و سروشتی دەوڵەتدا.

دوا نموونەش بۆ جیاوازی و ناکۆکییەکانی ئەو دوو دەوڵەتە هەڵوێستی ئەنقەرەیە لە بەرامبەر داگیرکردنی کوێت و ئەو سزا دەوڵەتییانەیە کە نەتەوە یەکگرتووەکان لە ١٩٩٠ەوە بەسەر عێراقی سەپاندووە.

لەناو ئەو هەموو تەنگژەیەدا، ئەوەی جێگەی سەرنجە، کێشە و ناکۆکییەکان ڕێگەی هاوکاری و هەماهەنگیان لە نێوان ئەنقەرە و بەغدا نەگرتووە. لە ١٩٢٥-١٩٢٦دا «عصبة الأمم» بەڕەزامەندیی هەردوو دەوڵەت کێشەی ویلایەتی موسڵی بەوە چارەسەرکرد کە کوردستانی خواروو بدرێتە پاڵ دەوڵەتی عێراق. هەروەها خۆ دوورە و پەرێزگرتنی تورک لە جیهانی عەرەب. لە بڕگە زەمەنییەکەی نێوان تەواوبوونی جەنگی دووەمی جیهانیی و داگیرکردنی کوێت لە ١٩٩٠، دەرفەتێکی ئەوتۆی نەهێشتبووەوە بۆ بەڕووی یەکدی هەڵقرژانی تورک و عێراق. تەنانەت ئەنقەرە لەگەڵ دوژمنە دێرینەکەشیدا، سوریە، کەمتر نێوانی ناخۆش بوو تا ساڵی ١٩٩٠.

لەوەش بەولاتر، هەردوو پایتەخت، لە ژێر پاڵەپەستۆی گیروگرفتە ناوەکییەکان و هەلومەرجە ئاڵۆزەکەی سیاسیەت لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، زۆرجار بەئەنقەست چاویان لە جیاوازی و ناکۆکییەکانی نێوانیان دەپۆشی و، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سەختییەکانی بەردەمیان ڕوویان لە هاوکاری و هەماهەنگی دەکرد. لەو فاکتەرانەی پاڵیان بەئەنقەرە و بەغداوە دەنا بۆ زیاتر هاوکاری و هەماهەنگی، لەلایەک کورد و کێشەی کورد بوو لە هەردوو ولاتەکەدا، لەلایەکی دیکە تەنگوچەڵەمە سیاسی و ئابووری و گیروگرفتەکانی ناو دەزگای فەرمانڕەوایەتی بوو، لەلای سێیەمیشەوە مەترسییەکانی ئێران بوو کە سنووری هاوبەشی لەگەڵ هەردوو دەوڵەتەکە

هەیە. ئەو مەترسیانەی ئێران بۆ سەر ئیستقراری ناوەخۆی هەر دوو دەوڵەت لە پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی هاتە ئاراوە. پێش ئیمام خومەینی ئێران و تورکیا، بەپێچەوانەی ئێران و عێراق، هەماهەنگێکی سیاسی و عەسکەری و ئابووری گەورەیان لە نێوان بوو، تەنانەت ئەو پەیوەندییە باشەی ئەنقەرە لەگەڵ تاران و بەغدا لە ناوەڕاستی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا هۆیەکی گرنگی هەوڵەکانی تورکیا بوو بۆ گەیشتن بەڕێککەوتننامەی جەزایر لە ٦ی ئاداری ١٩٧٥ لە دژی گەلی کورد.

لەبەر ڕۆشنایی ئەو وێنە تێکەڵ و پێکەڵەی پەیوەندییەکانی بەغدا و ئەنقەرە، ڕەنگە کارێکی بەکەڵک بێت لەو پەیوەندییانە بکۆڵرێتەوە، بەتایبەتی هی ئەم دە ساڵەی دوایی. چونکە وەک مەعلوومە تورکیا ڕۆڵێکی گرنگ لە پاراستنی ناوچەی ئاسایشی کوردستانی عێراق دەگێڕێ و بنکەیەکی ئاسمانی (ئەنجەرلیک)ی بۆ فڕۆکەکانی ئەمەریکا و بەریتانیا تەرخان کردووە. هەروەها ئەو هێرشە ئاسمانییانەی دەزگا سەربازییە ئاسمانییەکانی عێراق دەپێکێ لە دەوروبەری شاری موسڵ دا، لە ناو تورکیاوە هەڵدەستێ و ئەنقەرە وەک سعودیە و کوێت، نکۆڵی لەو ڕاستییە ناکات. ئەمانەش هەمووی مایەی ناکۆکی و گێژەنەیەکی سیاسی و دیپلۆماسیی گەورەیە لە نێوان بەغدا و ئەنقەرە، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو حاڵەشدا، عێراق هەست بەهیچ گرییەکی کوێرە ناکات بۆ هاوکاریی ئابووری و دیپلۆماسی لەگەڵ تورکیا، بەپێچەوانەی کوێت و سعودیە کە ئەم جۆرە پەیوەندی و هەماهەنگییە ئابوورییەیان نییە لەگەڵ عێراق.

مەبەستی ئەم لێکۆڵینەوە کورت و سەرپێییە، شیکردنەوەی ئەم پەیوەندییانەیە بۆ تێگەیشتنی هەندێ لە ڕووگەکانی سیاسەت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. هەروەها تێگەیشتنی چەند لایەنێکی گرنگی ئەو هەلومەرج و دەوروپشتەی بزووتنەوەی نەتەوەیی و دیموکراسی گەلی کورد تیا دەجوڵێتەوە.

## ئاوڕێک لە مێژووی نزیک

لە ماوەی بیست ساڵی ڕابردوودا، عێراق هەمیشە وەکو دەوڵەتێکی گرنگ و بایەخدار سەیری تورکیای کردووە، ئەگەرچی لە دوای ڕووخانی سیستەمی کۆنی سیاسەتی جیهانی و دوای کۆتایی هاتنی شەڕی ئێران بەسەرکەوتنێکی دیار بۆ عێراق، بەغدا تا ڕادەیەک کەوتە هەوای بەبێ بایەخگرتنی دەوڵەتانی ناوچەکە، لەوانەش تورکیا.

ئەوی ڕاستی بێت، زۆرن ئەو هۆیانەی عێراق و تورکیایان خستبووە سەر سکەی هاوکاری کردنێکی هاوبەش لە ماوەی چارەکە سەدەی ڕابردوودا، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم ڕاستییە، ڕەنگە هێماکردن بەچەند نموونەیەک بەس بێت:

یەکەم: گەلی کورد هەمیشە مایەی سەر ئێشەیەکی زۆر بووە بۆ ئەنقەرە و بەغدا لە پێناو داواکردنی مافە سیاسی و ڕۆشنبیرییەکانی خۆی بەپێچەوانەی نموونەی ئێران و عێراق، لە پێش ساڵی ١٩٩٠ تورکیا هیچ پەیوەندییەکی ئەوتۆی لەگەڵ بزووتنەوەی کورددا لە هیچ پارچەیەکی کوردستان نەبووە. بگرە نە ڕاستەوخۆ نە ناڕاستەوخۆ بەتەنگ ئەوەوە نەبوو کوردی عێراق یان ئێران لە دژی بەغدا و تاران بەکار بهێنێ.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هەر کاتێک عێراق یان ئێران پێویستی بەیارمەتی ئەنقەرە هەبووبێت بۆ سەرکوتکردنی کورد، تورکیا درێغی لە درێژکردنی دەستی یارمەتی نەپاراستووە. تەسلیم کردنەوەی شێخ ئەحمەد بارزانی لە ١٩٣٣ بەحکوومەتی عێراق و هاوکاریکردنی بەغدا و تاران لە شەڕ و هەوڵی گەمارۆدانی بارزانییەکان لە ساڵی ١٩٤٧دا نموونەی بەرچاوی ئەم حاڵەن. هەروەها دواتریش لەم مەیدانەدا درێغی نەکرد، بەتایبەتی لە ساڵانی ١٩٦٣ و ساڵی ١٩٧٨ کاتێک پەیمانێکی نهێنی لەگەڵ عێراق بۆ پاراستنی ئاسایشی سنووری مۆر کرد.

خەم و ترسی تورک لە کوردەکانی ناو تورکیا، هەمیشە سەرچاوەیەکی گرنگی گیروگرفتەکانی ئەو وڵاتە بووە. هەمیشەش پردێکی گرنگی بەیەک

گەیشتنەوەی ئەنقەرە و بەغدا بووە.

دووەم: لەگەڵ سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران لە شوباتی ١٩٧٩، ترسێکی هاوبەش ئەنقەرە و بەغدای داگرت. ترس لە تاوسەندنی بزووتنەوەی ئایینی لە ناوچەکەدا. هەروەها ترس لەو بانگەشە پڕ یەکسانی و عەدالەتەی بەدروشمەکانی شۆڕشی ئیسلامییەوە دیار بوو. بۆیە جێگەی سەرسوڕمان نییە ئەگەر بزانین لە ئەنقەرە و بەغدا، لەیەک کاتی زۆر نزیکدا، دوو گۆڕانکاریی گەورە ڕوویان دا:

هاوینی ساڵی ١٩٧٩ گۆڕانێک ڕوویدا و سەرۆک کۆماری پێشوو لادرا و سەرۆکی ئێستای عێراق تەواوی ئیشوکارەکانی بەڕێوەبردنی وڵاتی گرتە دەست. گومان لەوەدا نییە کە ئەم گۆڕانە ئەگەرچی لە ڕووکەشدا خەڵکانێکی مەدەنی کردبوویان، بەڵام لە جەوهەردا کوتەکی سەرباز و دەسگای سەربازیی لە عێراق دا بەهێز کرد و ئیتر کار لەگەڵ تاران گەیشتە شەڕ.

لە ئەنقەرەش، دوای نزیکەی ساڵێک، سەرۆکی ستادی ئەرتەش ژەنەراڵ کەنعان ئیڤرین کودەتایەکی سەربازی ئەنجام دا. ئەگەر چی بیانووی ئیڤرین بۆ کودەتاکەی ڕاگرتنی شاڵاوی ئەو توند و تیژیە بوو کە جادەکانی ئەستەمووڵ و ئەنقەرەی گرتبووەوە لە نێوان چەپی سۆسیالیستی و ڕاستی نەتەوەییدا، بەڵام جەوهەری مەبەست لە کودەتاکە قایمکردنی دەوڵەت و کۆمەڵگای تورک بوو لە ڕووی شاڵاوی بزووتنەوەی ئایینی لە دەلاقەی ئێرانەوە.

بێگومان، بێجگە لەم دوو هۆیە، هۆی دیکەش هەبوون بۆ هاوبەشیی بەغدا و ئەنقەرە لە خواستی هاوکاری. تورکیا چاوی لە نەوت و هاوکاریی ئابووری بوو لەگەڵ عێراق بەو پێیەی کە خۆی وڵاتێکی بێ نەوتە و لەو نەوتەی عێراقیش پێی وایە ئەو لە هەموو وڵاتێکی دیکە شایەستەترە بۆ کەڵک وەرگرتن لێی.

لەو بەرامبەرەشدا، بەغدا پێی وابوو تورکیا بنکەیەکی ئەمەریکاییە لە

ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و دەورێکی گرنگ دەگێڕێ لە بەرگرتن لە هەڵکشانی دەسەڵاتی ڕوسیا و کۆمۆنیزمی بۆ ناوچەکە. بۆیە خۆشکردنی پەیوەندی لەگەڵ ئەنقەرە تا ڕادەیەکی زۆر ڕێگری بڵاوبوونەوەی کۆمۆنیزمییە لە ناو عێراق. هەروەها دەکرێ لە ڕێگەی تورکیاوە دەستی بگەیەنێتە واشنتۆنیش، ئەمانە بێجگە لەوەی ئەنقەرە هاوپەیمانێکی ناوچەییشە بۆ بەغدا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەر هەڵایسانێکی کوردی یان ئایینی لە ناو عێراقدا، ئەمە بێجگە لە بایەخە جوگرافیە ستراتیژییەکەی تورکیا بەوەی کە کورتترین ڕێگەی نێوان عێراق و ئەوروپایە. لێرەدا پێویستە هێما بەوە بکەین کاتێک سوریە لە نیسانی ساڵی ١٩٨٢ سنووری لە ڕووی نەوت و بازرگانیی عێراق ڕاگرت و ڕێژەی ناردنی نەوتی عێراق بۆ دەرەوە لە یەک ملیۆن و چوار سەد هەزار بەرمیلی ڕۆژانە هاتە خوارەوە بۆ شەش سەد هەزار بەرمیل، بۆیە تورکیا بەپەلە کەوتە هاوکاریکردنی عێراق بۆ بەرزکردنەوەی توانستی بۆڕیە نەوتیەکەی لای خۆی بۆ یەک ملیۆن و چوار سەد هەزار بەرمیلی ڕۆژانە. هەروەها ڕێگەی زاخۆ کەوتە ئەوپەڕی چالاکیی گواستنەوەی کەلوپەلە بازرگانییەکانی عێراق. ئەم هاوکاریە لە سەردەمی شەڕی ئێران- عێراقدا ئەوەندە گەشەی کرد کە ئیتر تورکیا بوو بەشەریکی یەکەمی عێراق لە بوارێ بازرگانی و هاوکاریی ئابووریدا. دواتریش کاتێک ئەمەریکا پەیوەندییە دیپلۆماسیەکانی خۆی لەگەڵ عێراق تازە کردەوە لە ساڵی ١٩٨٤، تورکیا و عێراق ئاسۆیەکی تازەیان لەبەردەمدا کرایەوە بۆ گەشەپێدانی هاوکاریە ئەمنی و سیاسی و ئابوورییەکانی خۆیان لە ژێر چەتری ئەمەریکادا.

دوای کۆتاییهاتنی شەڕی ئێران و عێراق لە ساڵی ١٩٨٨ ئاسۆیەکی گەورەتر لەبەردەم گەشەسەندنی هاوپەیمانێتی لە بەینی بەغدا و ئەنقەرە کرایەوە. ئەوەی زۆرتریش ئەم ئاسۆیەی فراوانتر کرد دوو هۆی گرنگ بوون غەیری ئێران.

یەکەم: هەر دوو دەوڵەت ئەنجامدەری سیاسەتێکی ڕەگەزپەرستانە بوون

لە دژی کورد، ئەو لە کوردستانی سەروو، ئەوەی دیکەش لە کوردستانی خواروو، هەروەها هەردووکیان لەو ساڵانەدا ڕووبەڕووی کێشەیەکی هاوبەش بووبوونەوە کە ئەویش گەشەسەندنی شەڕی پارتیزانیی کورد بوو لە هەر دوو دیوی کوردستاندا.

تاوسەندن و پتەوتربوونی ئەم دوو شەڕە پارتیزانییە لە ژێر کارتێکردنەکانی شەڕی عێراق و ئێران، پاڵی بەهەردوو دەوڵەتەکە دەنا بۆ ئەنجام دانی هاوکاریەکی زۆرتری سەربازی و سیاسی لە نێوانیاندا، لێرەدا شایەنی گوتنە کاتێک عێراق چەکی کیمیاوی لە دژی پێشمەرگەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان بەکارهێنا لە ناوچەی بادینان لە شەڕی ئەنفالدا بەهاری ١٩٨٨، بەشێکی خەڵکی ناوچەکە دەربەدەری ناو تورکیا بوون، بەڵام تورک لەبەر هاوپەیمانێتەکەی لەگەڵ عێراق، وەکو پێویست بایەخی بەو پەناهەندانە نەدا و بگرە تووشی زۆر سەر ئێشەی کردن و هەمیشە هەوڵی ئەوەی دەدا قەناعەتیان پێ بکات بگەڕێنەوە عێراق. هەر لەو کاتەدا سەرنشینانی یەک لە ئۆردووگاکانی پەنابەران لە تورکیا تووشی ژەهر دەرخواردکردن هاتن. هەندێ لە ڕاپۆرتە ڕۆژنامەنووسییەکانی ئەو کاتە بەدووریان نەدەزانی ژەهر دەرخواردکردنەکە دەستی عێراقی تێدا بێت بەهاوکاریکردنی تورکیا.

دووەم: دیسان هەر دوو دەوڵەت خەمی پەرەسەندنی بزووتنەوەیەکی ئاینییان بوو کە گومان دەکرا دەستی ئێرانی لە پشت بێت، ئەم بزووتنەوەیە ئەگەرچی لە عێراقی ١٩٨٨ و ١٩٨٩ و ١٩٩٠ دا توندتر و تیژتر بوو لەوەی تورکیا، بەڵام تورکەکان بەقەدەر بەغدا و بگرە زۆرتریش لەو بزووتنەوە ئاینییە دەترسان. هۆی ئەم ترسەش ئەوەبوو کە بەشێکی گرنگی دانیشتوانی ئێران شیعەن یان سەر بەڕێچکە جیاوازەکانی شیعەگەرێتین (عەلەوی و بەکتاشی)، هەروەها حزبە ئاینییەکان بەتایبەتی لەناو سوننەکاندا، خەریکی بەکەڵک وەرگرتن لە یاساکانی تورکیا، ئەوسا خەریک بوو دەستیان دەگەیشتە ناو پەرلەمان و حکوومەت

و زانکۆکان و لەشکر.

ئەم هۆیانە وایان کردبوو بەغدا و ئەنقەرە مشووری گەشەپێدانی هاوکاری بدەن.

بەڵام لە هەمان کاتدا کۆمەڵێک کێشە و ناکۆکیش هەبوو لە نێواندا، لەوانە: پەیوەندییە گەرمەکانی بەغدا و مۆسکۆ لە نێوان ساڵانی ١٩٧١-١٩٧٩، ئینجا مۆرکردنی هاوپەیمانییەکی سیاسی و عەسکەری و هەلزانی چەکی ڕووسی بۆ عێراق ساڵی ١٩٧٢ و ڕاگەیاندنی بەرەیەکی سیاسیی ناوخۆ لەگەڵ حزبی کۆمۆنیستی عێراق لە ١٩٧٣ دا، ترسێکی گەورەی بۆ ئەنقەرە نابووەوە ئەگەرچی ترسەکەی ئەنقەرە گەلێ بچووکتر و بێ دەنگتر بوو لەوەی شای ئێران.

کێشەیەکی دیکە لەو بەینەدا مەسەلەی تورکمانەکانی عێراق بوو. ڕاستە ئەنقەرە ڕاستەوخۆ تێکەڵاوی کێشەی تورکمانەکان نەدەبوو لە عێراقدا، بەڵام بەغدا پێی وابوو بەشێک لەوانە هاوکارییەکی نادیاری تورکیا دەکەن و خۆیان بەعێراقی نازانن و چاویان لەوەیە ویلایەتی موسڵ بگەڕێتەوە بۆ تورکیا.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هاوکاری و تەبایی لەو کاتەدا زاڵ بوو بەسەر ڕووگەی گشتی پەیوەندییەکانی عێراق و تورکیا. دواتر ترسەکانی ئەنقەرە لە عێراق گەلێ زیادیان کرد کاتێک ئەمەریکا و دەوڵەتانی ڕۆژاوا ڕایان گەیاند؛ کە عێراق بۆتە خاوەنی جبەخانەیەکی گەورەی چەکی کۆمەڵکوژ و ئەم جبەخانەیە هەڕەشە لە تەواوی دەوڵەتانی ناوچەکە و ئەمن و ئاسایشی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەکات.

## عێراق و تورکیا: سەردەمی دوای شەڕی کوێت

پێدەچوو ئەم جۆرە تێکەڵ و پێکەڵییەی پەیوەندی لە نێوان عێراق و تورکیا هەمیشە زەمینەی بۆ ئەوە خۆش کردبێت کە لەگەڵ یەکەم ڕووداو،

یان گۆڕانکاریی گەورە پەیوەندییەکان تووشی هەڵوەشانەوە بن.

بۆیە دوای ڕووخانی بلۆکی سۆشیالیستی لە کۆتایی هەشتاکان و سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوودا، هاوپەیمانێتییەکەی بەغدا و ئەنقەرە کەوتە بەر مەحەکێکی تازە و گرنگ. ئەوەی زۆرتریش ئەم هاوپەیمانێتییەی بەرەو تەنگوچەڵەمە برد داگیرکردنی کوێت بوو لەلایەن سوپای عێراقەوە لە ٢ی ئابی ١٩٩٠.

لە سەردەمی جیهانیی ڕۆژهەلات و ڕۆژاوا، تورکیا جێگەی بایەخ پێدانێکی گەورە بوو لە ناو هاوپەیمانێتی ناتۆدا. ئەمەریکاییەکان وایان لێکدەدایەوە کە تورکیا دیواری بەربەستکردنی هەڕەشە و مەترسییەکانی یەکیەتی شۆرەوییە. هەروەها مەودایەکی جوگرافی لە باریشە بۆ چاودێری کردنی چوست و چالاکییە جیاوازەکانی شۆرەوی.

کە سیستەمە کۆنەکەی جیهان ڕووخا، ئەمەریکاییەکان لێکدانەوەیان بۆ دەورە گرنگەکەی تورکیا نەگۆڕا، بەڵام مەبەستەکانی لێکدانەوەکە گۆڕا: لە ژێر باڵی سیستەمی تازەی جیهان، ئەمەریکاییەکان پێیان وابوو ئیتر ئەنقەرە دەتوانێ دەسەڵاتی خۆی بۆ ناو ئاسیای ناوەڕاست درێژ بکات، بەتایبەتی بۆ ناو ئەو وڵاتانەی تورکی زمانن وەک ئازەربیجان. هەروەها دەتوانێ لەم بوارەدا پردێکی گرنگ بێت بۆ گواستنەوەی نەوتی دەریای قەزوین، لەوەش گرنگتر پێیان وابوو تورکیا نموونەی سیستەمێکی ڕۆژاوایی لەبارە بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دوای چاککردنەوەی تۆماری هەڵوێستە چەوتەکانی بەرامبەر بەکورد و مافی مرۆڤ، هەروەها دوای کەمکردنەوەی دەسەڵاتی سوپا لەناو سیاسەتی وڵاتەکەدا، بۆیە واشنتۆن بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ کەوتە هاندانی تورکیا بۆ گەشەپێدانی پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئیسرائیل و وڵاتە عەرەبییەکان. بەو ئامانجەی ئەنقەرە ڕۆڵێکی گرنگ لە دروستکردنی ڕۆژهەڵاتی تازە بگێڕێت، لە تەک ئیسرائیل و میسر و ئوردن. دیار بوو عێراق وای لێک نەدەدایەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە وای دەزانی کە ئیتر بایەخە گەورەکەی

تورکیا بۆ ڕۆژئاوا کۆتاییهات بەڕووخانی شۆرەوی و ئیتر ڕۆژاوا وەکو جاران مشووری گەشەپێدانی هاوپەیمانێتییەکە ناخوات لەگەڵ ئەنقەرە. لەوەش بەولاوە پێی وابوو ئیتر تورکیا بەهۆی تاوسەندنی ناکۆکییەکانی لەگەڵ دیمەشق، تاقەت و توانستی ئەوەی نەماوە. بگرە هەندێ لە چاودێرە سیاسییەکان بەدووری نازانن ئەم جۆرە لێکدانەوەیەی عێراق بۆ دەوری تورکیا لە جیهانی تازەدا یەک لەو هۆیانە بووبێت کە پاڵی بەبەغداوە نا بۆ پەیداکردنی تەماحی ئەوەی ببێتە گرنگترین دەوڵەتی ناوچەی سەرووی کەنداو، هەروەها لەم ڕێچکەیەشەوە پەیداکردنی تەماحی هەڵلووشینی کوێت و میرنشینە بچووکەکانی کەنداو.

شەڕی عێراق و دەوڵەتانی هاوپەیمان بۆ ڕزگارکردنی کوێت لە ١٩٩١دا دەرگایەکی گەورەی لەبەردەم چەسپانی سیستەمی تازەی جیهانیدا کردەوە. تورکیا لە پێشەوەی ئەو دەوڵەتانە بوو کە هەستی کرد دەبێ بەچاوی بایەخ و تێگەیشتنەوە سەیری ئەو سیستەمە تازەیە بکات و هەوڵی خۆگونجاندن و کەڵک لێ وەرگرتنی بۆ بدات. ئەوەبوو هەر لە بەرەبەری کۆتایی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو، ئەنقەرە کەوتە هەوڵی چوونە ناو کۆمەڵگای ئەوروپی، بگرە تورغۆت ئۆزال کە ئەوسا سەرۆک حکوومەتی تورکیا بوو، کەوتە هەوڵی ڕیفۆرمێکی ئابووریی لە ناو وڵاتەکەیدا، بەڵام بەپێچەوانەی تورکیا، عێراق، کەوتە بەرپەرچدانەوەی ئەو سیستەمە و دوژمنایەتی کردنی و خۆ دابڕاندن لە کۆمەڵگای دەوڵەتی و ئیقلیمی، دواتر شەڕی کوێت و سزا دەوڵەتییەکان زەبرێکی کوشندەیان لە عێراق دا.

دوای داگیرکردنی کوێت لە ئابی ١٩٩٠، هەق و حسێبەکانی عێراق لە بارەی تورکیاوە تا ڕادەیەکی بەرچاو ئاوەژوو دەرچوون. چونکە لە بواری کۆبوونەوەی لەشکری سی دەوڵەتی هاوپەیماندا لە دژی عێراق، تورکیا یەکێک لە گرنگترینی ئەو دەوڵەتانە بوو. دواتر ڕۆڵی ئەم دەوڵەتە زیاتری کرد کاتێک سزا دەوڵەتییەکان بەسەر عێراق سەپێنرا و ناوچەی دژەفڕینی کوردستانی عێراق دامەزرا. هەروەها دوای تاوسەندنی ناکۆکییەکانی نێوان

ئەمەریکا و ئێران لە ۱۹۹۲ بەدواوە.

لێرەوە، ئەمەریکاییەکان زۆریان مەبەست بوو ئەنقەرە دەورێکی گرنگ لە ڕووبەڕووبوونەوەی ڕژێمی عێراقدا بگێڕێ بەتایبەتی بۆ ڕزگارکردنی کوێت و دوای ئەو ڕزگارکردنەش.

سەرۆکی ئەو کاتەی تورکیا تۆرغۆت ئۆزال چاوی لە بووژاندنەوەی دەوری وڵاتەکەی بوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. هەروەها دەیویست ئابووری وڵاتەکەی بەهێز بکات لە ڕێگەی گەشەپێدانی پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەورووپا و ئەمەریکا. بۆیە لەو سەردەمەدا ئەنقەرە کەوتە تازەکردنەوەی داواکارییە پێشووەکەی لەمەڕ چوونە ناو یەکێتی ئەورووپاوە. شەڕی کوێتیشی بەهەل زانی بۆ دابینکردنی هاوپەیمانیەتییەکی توندوتۆڵتر لە جاران لەگەڵ واشنتۆن و دەوڵەتانی ڕۆژاوا.

بەو پێیەی تورکیا ئەندامی ناتۆیە، ڕۆڵێکی سەربازیی گرنگی گێرا لە گەمارۆدانی عێراق و دواتر دەرکردنی سوپای عێراق لە کوێت، هەروەها ئەگەرچی هەڵوێستێکی مرۆڤ دۆستانەی دەرنەبڕی لە کاتی کۆچڕەوە ملیۆنییەکەی کورد لە بەهاری ۱۹۹۱دا، بەڵام تۆرغۆت ئۆزال لە پێشەوەی ئەو سەرۆکانە بوو کە لە کۆتایی ئاداری ۱۹۹۱دا، پێشنیاری بۆ کۆمەڵگای دەوڵەتی کرد ناوچەیەکی ئاسایش بۆ گەڕانەوە و نیشتەجێ بوونەوەی کورد لە کوردستانی عێراق دروست بکات، دواتریش بڕیاری دا، بەڕەزامەندیی پەرلەمان، بنکەی ئاسمانیی ئینجرلیک لەبەردەم فڕۆکەکانی ئەمەریکا و بەریتانیا بکاتەوە بۆ پاراستنی ناوچە ئاسایشییەکەی کوردستانی عێراق.

ئەو هەڵوێستە تازەیەی تورکیا بەرامبەر بەناوچەی دژەفڕین و پاراستنی کوردی عێراق ترس و لەرزێکی زۆری لە بەغدا دروست کرد. چونکە نزیککەوتنەوەی ئەنقەرە لەگەڵ دەوڵەتانی ڕۆژاوا لە ئاست مەسەلەی کوردی عێراقدا تەواوی تەرازووی هێزی ناوچەیی بەرامبەر بەکورد دەگۆڕێت، پابەند بەو ترس و لەرزە تاریق عەزیز لە حوزەیرانی ۱۹۹۱دا

سەفەری ئەنقەرەی کرد و لەگەڵ ئۆزال کۆبووەوە و ویستی بەوەی بترسێنێ ئەگەر تورکیا بەردەوام بێت لە هاوکاریکردنی ئەمەریکا لە دژی عێراق، ئەوا بەغدا ناچار دەبێت گفتوگۆ سیاسییەکەی لەگەڵ حزبە کوردییەکانی کوردستانی عێراق بگەیەنێتە ئەنجامێک کە ڕەنگە بەقسەی عەزیز و بەغدا، زەرەرێکی زۆر بەهەلومەرجی ناوەوەی تورکیا بگەیەنێت.

بەڵام وەڵامی چاوەڕوان نەکراوی ئۆزال بۆ تاریق عەزیز ئەوەبوو کە ئەنقەرە ئێستا پێیخۆشە بەغدا لەگەڵ کورد گفتوگۆ بکات و چارەیەکی سیاسی بۆ کێشەکەی بدۆزێتەوە بەو شێوە مافەی کە کورد و بەغدا لەسەری پێکدێن.

ئەم هەڵوێستەی ئەنقەرە دابڕانێکی گەورەی لە نێوان تورکیا و عێراق دروست کرد. بگرە تورکیا چوست و چالاکانە بەشداریی سەپاندنی سزا دەوڵەتییەکانی کرد بەسەر عێراق، بەتایبەتی ئەو سزایانە داواکارییەکی گەرمی ئەمەریکایە لە هاوپەیمانەکانی.

بەڵام دوای کۆتایی هاتنی شەڕی کوێت کۆمەڵێک ڕەگەزی تازەی ڕووداوی سیاسی لە ناوچەکەدا دروستبوون کە کارێکی زۆریان لە چۆنیەتی پەیوەندییەکانی ئەنقەرە و بەغدا کرد. لە لایەکەوە هەنگاوەکانی ڕیفۆرمی ئابووری لە تورکیا ئەنجامی ئەوەی لێکەوتەوە ئەنقەرە ڕووبەڕووی چەندین گیروگرفتی ئابووری و دراویی گەورە بێت. لەولای ترەوە ناکۆکییەکانی تورکیا لەگەڵ یۆنان لەسەر مەسەلەی داگیرکردنی قوبرس زۆر زیادی کرد و گەیشتە لێواری تەقینەوەی سەربازیی، لەلایەکی سێیەمەوە ناکۆکییەکانی ئەنقەرە لەگەڵ دیمەشق تا دەهات گەرمتر و ناخۆشتر و ئاڵۆزتر دەبوو بەتایبەتی سەبارەت بەکێشەی ئاوی فورات و پرۆژەی گاپی تورکی، بەڵام لەوانە گرنگتر مەسەلەی (PKK) بوو لە نێوان تورکیا و عێراق و سوریادا.

لە ساڵی ١٩٩١ بەسەرەوە (پ.ک.ک) کەوتە بەهێزکردنی پایگاکانی خۆی لە شاخەکانی کوردستانی عێراقدا. لە هەمان کاتدا چوست و چالاکییەکانی زۆر زیادیان کرد لە ناو تورکیا.

ئۆزال لەو ساڵەدا هەوڵێکی دا لە ڕێگەی چەند ڕۆژنامەنووسێکی تورکەوە گفتوگۆیەکی سیاسی لەگەڵ ئۆجەلان دروست بکات، بەڵام بەئەنجام نەگەیشتنی ئەو گفتوگۆیە و دواتریش وەفاتکردنی ئۆزال کێشەی کورد لە ناو تورکیادا ئاڵۆزتر کرد.

لە ڕاستیدا تاوەکو سەرۆکی پێشووی سوریا حافظ ئەلئەسەد مابوو، هەروەها تاوەکو عەبدوڵلا ئۆجەلان لە دیمەشق دەرنەکرابوو و مەسەلەی نزیککەوتنەوەی سوریا و عێراق لە ئارادا نەبوو، بەغدا کەمتر مەودای ئەوەی لە پێش چاو بوو کەڵک لە کارتی (پ.ک.ک) بکات. چونکە ئەو سەردەمە تاکە خاوەنی ئەم کارتە دیمەشق بوو، بەڵام دوای وەفاتکردنی ئەسەد و دەرکردنی ئۆجەلان لە سوریا و ئینجا گیرانی لە نایروبی لە شوباتی ١٩٩٩ مەودایەکی لەبار لەبەردەم بەغدا ڕەخسا بۆ کەڵک وەرگرتن لە (پ.ک.ک).

لەو کاتانەدا چەندین ڕۆژنامەی جیهانی ئیشارەتیان بەوە کرد کە (PKK) و حزبێکی سیاسیی لە کوردستانی عێراق کەوتوونەتە هاوکاری بۆ دنەدانی شەڕی پارتیزانی لە دژی تورکیا و حکوومەتی هەرێمی کوردستانی عێراق لە هەولێر، هەر لەم نێوانەدا جار جاریش باس لە هاوکاریکردنی ڕێکخراوی موجاهدینی خەڵقی ئێرانیش دەکرا لەگەڵ ئەم هاوپەیمانێتییەدا. تا ئەندازەیەکی زۆر چەندین سەرچاوەی دیکەی ئاگاداریش لە ناوچەکەدا ئەم ڕاپۆرتە ڕۆژنامەنووسیانەیان تەئکید کردەوە. بگرە هەندێکیان ئیشارەتیان بەژوورێکی هاوبەشی عەمەلیاتی سەربازی دەکرد لە شاری کەرکووک.

بەڵام دیاربوو ئەوەی هەر زوو گرێی خستە ناو ئەو هاوپەیمانێتییە تازەیە، لاوازبوونی (PKK)و بڕیارە بەناوبانگەکەی بوو لە بابەت وازهێنانی لە خەباتی چەکداری لە دژی تورکیا، بۆیە ئەم حزبەی ماوەی چواردە ساڵ شەڕوشۆڕی کوردی لە دژی ئەنقەرە و ئینجا ماوەیەک دژی کوردی عێراق، بەڕێوەبرد، توانیبووی ببێتە ڕەگەزێکی گرنگی ناکۆکییەکانی نێوان دیمەشق

و ئەنقەرە، بەڵام دواتر نەیتوانی هەمان ڕۆڵی گرنگ بگێڕێ لە نێوانی بەغدا و ئەنقەرە. بگرە هەر زوو بەغدا لە لایەک و حزبە کوردییەکەی ناو کوردستانی عێراق لە لایەکی دیکە پشتیان لە (PKK) کرد و بەکارتێکی سووتاویان لە قەڵەم دا.

## تورکیا و سزاکانی سەر عێراق

ئەنقەرە نایشارێتەوە کە گەورەترین زەرەرمەندی دەست سزاکانی عێراقە، لەم بوارەدا تورکیا جارجار هێما بۆ ٣٠ ملیار دۆلار دەکات وەک زەرەری ڕاستەوخۆی ئابووری لەم سزایانە. بۆیە هەمیشە بانگدەری ئەوە بووە کە بەڵکو ئەو سزایانەی سەر عێراق سووک بکرێتەوە و کۆمەڵگای دەوڵەتی قەرەبووی زیانەکانی بکاتەوە.

ئەمەریکاییەکان لە جیاتی عێراق وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاستیان بۆ ئەنقەرە پێشنیار دەکرد کە تیایدا بکەوێتە کەڵک وەرگرتنی ئابووری تا ئەو بۆشاییەی بۆ پڕ بکرێتەوە کە لە ئەنجامی سزاکانی سەر عێراق تووشی هاتبوو. هەروەها ڕاستەوخۆش هەوڵێکی زۆری دا بۆ کەڵک گەیاندن بەئابووری تورکیا لە چەند ڕێگەیەکی دیکەوە:

یەکەم: قەناعەت پێکردنی یەکێتی ئەوروپا کە ڕێگەی خۆش بکات لەبەردەم وەرگرتنی تورکیا لە ڕیزەکانی خۆیدا. یاخود هەر نەبێ بیپاڵێوێت بۆ ئەو وەرگرتنە، وەک دواتر یەکێتی ئەوروپا بڕیاری لەسەر دا.

دووەم: وەرگێڕانی ڕووگەی بۆریە نەوتیەکەی گواستنەوەی نەوتی دەوڵەتانی دەریای قەزوین لە ئێرانەوە بۆ تورکیا کە ئەمە لە ئەنجامدا کلیلێکی گرنگی ئابووری ناوچەکە دەخاتە ناو دەستی تورکەکانەوە.

سێیەم: چاوپۆشی لەو بازرگانییە نەوتییەی لەگەڵ عێراق دەیکات لە ڕێگەی زاخۆوە. ئەمەش وەک تورک خۆیان دەیڵێن قازانجێکی گەورە بەبووژاندنەوەی ئابووری ناوچەکانی دیاربەکر و ماردین و هەکاری دەگەیەنێ.

چوارەم: هەوڵدان بۆ قەناعەت پێکردنی ئیسرائیل و سعودیە بۆ کڕینی ئاو لە تورکیا کە ئەمە لە حاڵەتی جێبەجێ بوونیدا، کلیلێکی گەورەتری ئابووری بۆ تورکیا مسۆگەر دەکات لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەتایبەتی ئەگەر سوریا لە دوارۆژدا چووە ناو پرۆژەی ئەو ئاو کڕینەوە لە تورکیا.

پێنجەم: بێجگە لە مەیدانی ئابووری، واشنتۆن لە چەند مەیدانێکی دیکەشدا کەوتە یارمەتیدانی تورکیا، وەک مەیدانی ئەمنی و سیاسی. هاوکارییە سەربازییەکانی نێوان ئیسرائیل و ئەنقەرە، هەروەها گیرانی ئۆجەلان لە نایرۆبی، چەند نموونەیەکی بەرچاوی ئەو یارمەتییە ئەمنییانەی ئەمەریکان بۆ ئەنقەرە. ئەمە بێجگە لە فشار خستنە سەر یۆنان بۆ خاوکردنەوەی ناکۆکییەکانی لەگەڵ تورکیادا.

ئەمانەی سەرەوە بەشێکی کاریگەری ئەو ئامرازانەن کە واشنتۆن بۆ یارمەتیدانی ئەنقەرە بەکاریان دەهێنێ بۆ سووککردنی قورسایی زەرەری سزا دەوڵەتییەکانی سەر عێراق بۆ تورکیا. هەروەها بۆ قەناعەت پێکردنی لایەنە جیاوازەکانی ناو بازنەی سیاسیی تورک کە واز لەوە بهێنن فشار بخەنە سەر ئەنقەرە بۆ دوورکەوتنەوە لە میحوەری ئەمەریکا، یان تازەنەکردنەوەی مەرەخەس بۆ مانەوەی فڕۆکەکانی ئەمەریکا و بەریتانیا لە ئینجەرلیک.

لە بەرامبەر ئەم هەوڵ و تەقەللایانەی واشنتۆن، بەغداش بەپێی توانستەکانی خۆی لە هەوڵی دوورخستنەوەی ئەنقەرەیە لە ئەمەریکا، یا هەر نەبێ لەو بەشە سیاسەتەی ئەمەریکا کە پەیوەندی بەسزاکان و ناوچە دژەفڕینەکەی کوردستان هەیە. لەم بوارەدا عێراق ڕووی لە بەکارهێنانی (PKK) کرد، بەڵام زوو دەرکەوت ئەمە کارێکی بێ ئەنجامە و قازانجێکی زۆری عێراقی تێدا نییە. دواتر ڕووی لە گەشەپێدانی پەیوەندییەکانی کرد لەگەڵ سوریە، بەڵکو ئەم حاڵە ببێتە مایەی ترس و خەمی تورکیا و ئەویش لە باری خۆیەوە کەمێک لە عێراق بێتە پێشەوە بۆ لەنگەر ڕاگرتنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ سوریا، بەڵام دیاربوو ئەمەش ئەنجامێکی ئەوتۆی

بەدەستەوە نەدا، هۆیە سەرەکییەکەی ئەوەیش لەوەدا خۆی دەنوێنێ کە دیمەشقی ئێستا دیمەشقی جاران نییە و سەرۆکی ئێستای سوریا نایەوێ لەگەڵ تورکیا برینەکان بکولێنێتەوە، بگرە زۆرتر مەبەستی ئاساییکردنەوەی پەیوەندییەکانیانە.

بێجگە لەم دوو هۆیانە، هەوڵێکی زۆری دا، جیهانی دەوڵەتانی عەرەب لە دژی تورکیا بجووڵێنێ، بەو پێیەی عەرەب و تورک جۆرە ناکۆکییەکی مێژووییان لە نێواندایە. لەم بوارەدا چەندین یاداشتنامەی ئاراستەی ئەنجوومەنی دەوڵەتە عەرەبییەکان کرد لە قاهیرە بۆ ئەوەی قەناعەتی پێبکات لە دژی تورکیا بجووڵێتەوە. بەڵام ئەمانیش لە ژێر پاڵەپەستۆی تاوسەندنی ناکۆکییەکانیان لەگەڵ ئیسرائیل، نەیان دەویست دەرگای ناکۆکییەکی دیکە لە ناوچەکەدا لە ڕووی خۆیان بکەنەوە، بۆیە هیچ کامێکیان لەسەر هەڵوێستەکانی ئەنقەرە لە بەرامبەر بەغدا پەیوەندی خۆیان لەگەڵ تورک تێک نەدا.

زۆرجار لە بواری ترساندنی تورکیادا، عێراق ڕووی لەوە دەکرد کە ئەنقەرە بەوە بترسێنێ ناوچە دژە فڕینەکەی کورد لە نزیک سنووری تورکیا ڕەنگە ببێتە دەوڵەتێکی سەربەخۆ بەیارمەتیدانێکی ڕاستەوخۆی ئەمەریکا. ئەمەش یەکەم زەرەر، وەک عێراق بانگی بۆ دەدا، لە ئەنقەرە دەگەینێ، بۆیە دەبێ تورکیا هەرچی هەوڵێکی هەیە بەکاری بهێنێ بۆ ڕێگەنەدان بەفڕۆکەکانی ئەمەریکا و بەریتانیا لە خاکی ئەوەوە ناوچەی کوردستانی عێراق بپارێزن.

ئەم جۆرە بانگەشەیەی عێراق، بەپێچەوانەی هەوڵەکانی دیکەی تا ڕادەیەک کاریگەر بوو. ئەوە بوو تا ئێستاش تورک داوە ترسێک لە دڵ و دەروونیدا دروست بووە لەوەی کە نەوەکا ئەم هەلومەرجەی ئەمڕۆی کوردستانی عێراق، ناوچەکە بەرەو ئیحتمالی دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بڕوات، بەڵام دیسان سەرۆکی گەلی کورد مسعود بارزانی زیرەکانە ڕەفتاری لەم نێوانەدا کرد و بەردەوام هەوڵی ئەوەی دا کە ڕوونی

بکاتەوە کورد بەنیازی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆ نییە و نایەوێ زەرەر بەهیچ دەوڵەتێکی ناوچەکە بگەیەنێ.

بەڵام دیاربوو عێراق هەر لە بواری ترساندنی تورکیادا کاری نەدەکرد، بەڵکو زۆرتر دەیویست بەجوولاندنی تەماحە ئابوورییەکان ئەنقەرە قەناعەت پێ بکات خۆی نەبەستێتەوە بەسزا دەوڵەتییەکان و ئیتر ڕێگەی فڕۆکەکانی ئەمەریکا و بەریتانیا نەدات بۆ بەکارهێنانی ئاسمان و بنکەکانی تورکیا بۆ چاودێریکردنی کوردستانی عێراق.

لەم بوارەدا دەبێ ئیشارەت بەو ڕاستییە بکرێ کە بەغدا، بۆ یەکەم جار لە جیهانی عەرەب، دەستپێشخەرییەکی نوێی چەسپاند، ئەویش دەستپێشخەریی جوداکردنەوەی سیاسەتە لە ئابووری، واتە درێژەپێدانی هاوکارییەکی ئاسایی ئابووری لە هەموو کاتێکدا بێ گوێدانە جیاوازی و گێرمە و کێشە و ناکۆکییە سیاسیەکانی نێوان دەوڵەتان. لەگەڵ تورکیا لەو بوارەدا بەغدا سەرکەوتوو بوو، ئەگەرچی ئەنقەرە خۆی زۆرجار لەگەڵ دەوڵەتانی دیکەی جیهاندا نەیتوانیوە لەم بوارەدا سەرکەوتوو بێت.

پێدەچێ تا ڕادەیەک ئەم سیاسەتەی بەغدا سەری گرت لەناو تورکیادا، بەتایبەتی لەناو ئیسلامییەکان و چەپڕەوەکانی تورکیا دەنگی ئەوە دروستبوو کە تورکیا لە پێناو قازانجەکانی ئەمەریکا نابێت زیان لە قازانجە ئابوورییەکانی خۆی بدات.

هەروەها دەبێ لەگەڵ عێراق پەیوەندی دیپلۆماسی و ئابووری و، بگرە سیاسیش دروست بکاتەوە. لە ئەنجامدا ئەگەرچی بەفشارێکی زۆری ئەنجوومەنی ئاسایشی باڵای تورکیا کە دەسەڵاتی سوپا و ئەفسەرە گەورەکانی تورکیای بەسەرەوەیە ئەنقەرە توانی تا ئێستا درێژە بەهاوکاریەکانی خۆی بدات لەگەڵ ئەمەریکا لە دژی عێراق، بەڵام پێدەچێ لە بواری ئابووری و دیپلۆماسیەوە، لە ماوەی چوار پێنج ساڵی ڕابردوودا ئەنقەرە تا ڕادەیەکی هەست پێکراو ڕووە و ئاساییکردنەوەی پەیوەندییەکانی خۆی چووە لەگەڵ بەغدا، هەرچەند ڕادەی ئاساییکردنەوەکە

تا ئێستا ترسێکی ئەوتۆی لە واشنتۆندا دروست نەکردووە.

یەک لە ئامانجەکانی سیاسەتی بەغدا بۆ چاوپۆشین لە هەڵوێستەکانی ئەنقەرە و درێژەپێدانی هاوکاریی ئابووری لەگەڵیدا ئەوەبوو، کە بتوانێ کون و کەلەبەر بخاتە دیواری سزا دەوڵەتییەکانەوە. پێشتریش لە زۆر بواردا حکومەتی عێراق توانیبووی ئەم کونانە بخاتە دیواری سزاکانەوە، بەتایبەتی لەسەر ئاستی دەوڵەتانی عەرەبی و هەندێک لە دەوڵەتانی کۆنە بلۆکی سۆشیالیستیدا، بەڵام ئەم هەموو کون و کەلەبەرانە هیچی ئەوتۆیان پێنەدەکرا بەبێ هێشتنەوەی دوو شارێگاکەی تورکیا و ئوردن. هەر لە سەرەتای نەوەدەکانەوە بەغدا پێی وابوو لە ستراتیژی گەندەڵکردنی سزاکاندا، دەبێ تورکیا بایەخێکی زۆری پێبدرێت.

لێرەدا ڕەنگە جێگەی خۆی بێت هێما بەوە بکەین، کە عێراق سەفارەتخانەی خۆی لە تورکیادا هەر لە دوای تەواوبوونی شەڕی کوێت کردەوە و باڵیۆزی تایبەتی و هەڵبژاردەی بۆ دەنێرێت، ئەمە لە کاتێکدا ئەنقەرە تا پێش کەمتر لە ساڵێک باڵیۆزی نەبوو لە بەغدا، هەروەها قەناعەت پێکردنی سوریا بەکردنەوەی سنوور لە نێوانیاندا.

### دوا ئەنجام

لە دوا حسێبدا، ئەوەی بەدیققەت بەغدا ئاوڕی لێ نەداوەتەوە ئەوەیە؛ کە جومگە سەرەکییەکانی ئابووری و سیاسەت و ڕۆشنبیریی لە تورکیادا بەشێوەیەکی زۆر توند و بەهێز، هەر لە سەردەمی ژەنەراڵ کەمال مستەفا ئەتاتورکەوە بەستراوەتەوە بەئەمەریکا و ئەوروپا.

لە ژێر فشاری ئەو جومگانەدا پێناچێت ئامادە بێت دەستی یارمەتی و ڕزگارکردن بۆ ڕژێمی ئێستای عێراق درێژ بکات.

بۆیە هەر تەمایەک بەغدا بەئەنقەرەی هەبێت لەم بوارەدا ڕەنگە لە ئاسنی سارد کوتانەوە زیاتر هیچی دیکە نەبێ.

بەڵام لە هەمان کاتیشدا تورکیا نایەوێ سزا دەوڵەتییەکانی سەر عێراق

زۆر درێژەبکێشن، چونکە پێی وایە ئابووری تورکیا زەرەرمەندی گەورەی دەست ئەو سزایانەیە.

هەروەها نایەوێ هەلومەرجەکانی ئێستای عێراق و سیاسەتی ئەمەریکا لە بەرامبەر بەغدا بەگۆڕینی ڕژێمی ئێستا بشکێتەوە. بگرە نایەوێ لەم بوارەدا بەشداری لە هیچ نەخشە و پلانێکدا بکات کە بۆنی ڕووخاندنی ڕژێمی عێراقی لێ بێت.